# سەرەتا بومەلەرزەیەک

## بەهاوسەربونی ئیسلامی

دانانی

دایکی عبداللە



محرم – ١٤٢٥ هـ

# پێشکەش

١- ئەوانەی خۆیان بە پێشەوا دادەنێن و ئەیانەوێ ئاینی ئیسلام بکەنە ڕێی ژیانیان.

٢- بۆ ئەو زانا موسوڵمانانە هەست بە میللەتی خۆیان ئەکەن و ئەیانەوێ لە شوێنی خۆیان چارەسەر بۆ گیروگرفت دابنێن . بەتایبەتی گیروگرفتی بنەڕەتی کۆمەڵ کە ئافرەتە .

٣- بۆ ئەوانەی بە زمان دانیان ناوە بەوەی زۆر ژنە سوننەتە و چارەسەری گیروگرفتی ئەمڕۆی ژن زۆریە ، دەکات کە دەگاتە خۆیان لە ژنێك زیاتریان نیە و ئەگەر چەند ئافرەتیش خۆیان پێشکەشی بکەن ژن ناهێنێ و خۆشیان بە تاوانبار نازنێ .

٤- بۆ هەموو پیاوێك کە ئاینەکەی ئیسلامە و پەروەردەی ئیسلامە بەڵام دژی زۆر ژنەیە و لای وایە کارەکەی ڕاستە ، نازانێ تاوانبارە . ئەبێ هەموو پیاوێك هاندەر بێ بۆ زۆر ژنە لە هەر ئاستێك دابێت .

٥- بۆ ئەو خوشکانەی ماونەتەوە و شەرم ئەکەن ( لەبەر زۆری پڕوپاگەندەی دژ بە زۆر ژنە ) ناتوانن ڕای خۆیان بدەن کە بەڕاستی پێشیان خۆشە شوو بە پیاوی بە ژن بکەن .

٦- بۆ زۆربەی ئافرەتانی بێ پیاو و بێوەژن کە بەبێ ئەوەی بزانن خۆیان کردوەتە قوربانی ئەو چەند ئافرەتەی پیاویان هەیە و هەست بەبێ پیاوەکان ناکەن و پڕوپاگەندە دژی زۆر ژنە بڵاودەکەنەوە .

٧- بۆ ئەو کچانەی بێ پیاو و سەربەخۆ ئەژین و ژیانی پێ خۆشە و نازانن بە هاوسەربوون نیوەی ئاینە .

٨- بۆ هەموو نەزانەکان کە واتێدەگەن تاوانبار دەبن گەر بە پیاوێکی بەژن بڵێن ژن بهێنە یاخود ڕۆڵێکیان هەبێت لەو بارەیەوە .

# پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله نحمده و نستعينه و نستغفره و نعوذ به من شرور انفسنا و من سيئات اعمالنا ، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له . واشهد ان لا الله إلاّ الله وحده لا شريك له، هو الذي ارسل رسوله بالهدى و دين الحق ليظهره على الدين كله، واشهد ان محمداً عبده و رسوله (ﷺ).

خوای گەورە ( ﷻ ) لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێ :-

بسم الله الرحمن الرحيم ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ (١١٠) ﴾ آل عمران

واتە ئێوە باشترین ئوممەتن کە بۆ خەڵك هاتون فەرمان بە چاکە دەکەن و پیشگیری و نەهی لە خراپە دەکەن و بڕواتان بە خوا هێناوە.

پێغەمبەر ( ﷺ ) ئەفەرموێ : ﴿ من رأى منكم منكراً فليغيره بيده فإن لم يستطع فبلسانه فإن لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الأيمان ﴾

واتە : هەریەکێك لە ئێوە خراپەیەکی دیت ئەوا دەبێ بە دەست بیگۆڕێ ئەگەر نەیتوانی ئەوا بە زوبان واتە بە ئامۆژگاری کردن خراپە کە بگۆڕێ گەر نەیتوانی ئەوا لەدڵی خۆی ، ئەوەش لاوازترین باوەڕە . لەسەر ئەو بنەمایەدا ئەو کورتە باسەم نووسی بە هیوای سوود بەخشین . ئەو باسەش لە سەر داخوازی کردن و بەشوودانی کچە لەسەر ڕێگای ئاینی ڕووناکی ئیسلام. بێ گومان ئەو باسەم شتێکی نوێ نیە بەڵکو بۆ بەبیر هاتنەوەو پێ داچوونەوەیە بۆ هەموو دایك و باوکێکی باوەڕدار خوا پشتیوان بێت. چونکە چەندەها کچی گەنج هاتوونەتە لام و گلەیی یەگجار زۆریان لە دایك و باوکیان هەبوە و باسی دووری بیرکردنەوەی خۆیان و دایك و باوکیان ئەکرد، کە ئەوان بیرکردنەوەیان لە لایەك و دایك و باوکیان لە لایەکی تره . منیش وا هەستم کرد کچەکان زوڵم لێ کراون و زۆریان لێ ئەکرێ .

ئەبینین هەموو پێداویست و ئامرازێك هەیە و بەكار هاتووە لە دەورووپشتماندا بۆ بزواندنی ئارەزووە ڕەگەزیەكان . لە هەمان كاتدا ڕێی حەڵاڵی ژیان لە ڕۆڵەكان ئەگیرێت و یارمەتیان نادرێت بۆ گەیشتن بە هاوسەری خۆیان تا دووربكەونەوە لە ئاژاوە كەسایەتی و دەروونی و ئەبنە یارمەتی دەرێك بۆ منداڵەكانیان كە لەڕێ دەرچن و بكەونە ناو ژاوە و حەرامەوە .

من زیاتر باسی كچم كرد چونكە كچ بن دەست و شەرمن و بێ دەسەڵاتە . بەڵام گەنجەكە ئەتوانێ چارەسەری خۆی بكات بەوەی ئەو كچەش ئەبێ كچێكی تر بدینێتەوە و دەرفەتی لە كچ زیاترە بۆ بە هاوسەر بوون . بەڵام كچ ئەبێ چاوەڕێ بكات و ئەگەر هەلێكی لە دەست چوو ناگەڕێتەوە و ڕەنگە لە ئایندەی نزیكیش ئەو هەلەی دەست نەكەوێتەوە ، لەبەر بن دەستی و شەرم كردن ناتوانێ بەرامبەر خێزانەكەی ڕابوەستێ و داوای مافی ڕەوای خۆی بكات .

جا ئەو باسە چەند ئامۆژگاری یەكی تێدایە هیوادارم دایك و باوكان سوودی لێ وەربگرن و بە خۆیاندا بچنەوە ، وە هەندێك زیاتر بیر لە ئایندەی كچەكانیان بكەنەوە لە خۆ ئامادەكردن دابن بۆ ڕۆژی دوای ، ڕۆژی پاداشت و سزا لە سەر ئەو بنەڕەتەی كە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ

﴿ لاتحقرن من المعروف شيئاً ولوأن تلقى أخاك بوجه طليق ﴾ .

واتە: هیچ چاكەیەكت پێ كەم نەبێت هەتا ئەگەرئەوەندەش بێ بە ڕوویەكی خۆش پێشوازی برای موسڵمانت بكەی . ئەوەش پاداشتی هەیە ئەگەر چەند لە لامان ئاسانە ... كەواتە ئەی ئەگەر پشتی كچەكەت گرت و چاكەیەكت لەگەڵ كرد و ئایندەیدونیاو قیامەتت مسۆگەر كرد و كچەكەت دڵخۆش بوو !! ... ئەبێ پاداشتت چیبێت ؟ ..

هیوام وایە لەسەر ئەو ئایەتە ژیان ببەنەسەر كە خوای مەزن ئەفەرموێ ﴿ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا ﴾ . واتە : ئەوەی پێغەمبەر بۆتانی داناوە و هێناویەتی لەسەری بڕۆن و وەریبگرن و ئەوەی نەهی لێ كردونە لێی دووربكەونەوە .
الحشر :(٧)

وە باسی چارەسەرکردنی مانەوەی ئافرەتم کردوە بە ڕێگای زۆر ژن هێنان ،[٢] باسەش کە پیاو ناوێرێ خۆی لێ بدات وە زۆربەی ئافرەتیش دژایەتی دەکات ئەگەرچی باشترین چارەسەری ئەم ڕۆژگارەیە . دەبێ زۆر بە پیرۆزی تەماشای زۆر ژنە بکرێت و لە سەری بڕۆین تا لە تاوان دووربکەوینەوە .

ئەو باسەی کە ئافرەت زۆر ڕقی لێ دەبێتەوە ، پێویستە بە بیرکردنەوە و بۆچوونێکی ئیسلامی یانەو دوور لە خۆپەرستی باسی بکەین چونکە بەڕایی من تەوژمی گومڕایی و نەزانی دوو چەکیان بەرامبەر ژن بەکار هێناوە ... یەکەمیان بەرەڵلا ی بەناوی یەکسانی ژن و پیاو و ماف و سەربەخۆیی ، دووەمیان کە من بە درێژی باسی لێوەلەکەم ، زۆر ژن هێنانەکە سۆزی هەموو ژنێك ئەبزوێنێ ، بزوانێك کە دوورە لە ئیسلام و خۆ ئامادەکردن بۆ ڕۆژی دوای .

لەبەر ئەوە پێویستە ئەو بابەتە لە ئێمەی ئافرەت دەربچێ .

گومان لەوەدانیە کە زۆر ژن بۆتە خاڵێکی زەق لەدەست دوژمنانی ئیسلام کە بتوانن سەرنجی خەڵك بەگشتی و ئافرەتان بە تایبەتی ڕابکێشن کە چۆن پیاو زیاتر لە ژنێك دەهێنن ، وا لە ئافرەتان بگەیەنن کە زۆر ژنە خراپ و ناڕەواییە پەنا بەخوا.بەلام وەلام دانەوەی ئەوان ئەبێ لە ئێمەوە بێت . ئێمەیئافرەتانی موسڵمان بیر لە لایەنە چاکەکەی فرە ژنی بکەینەوە چونکە خوای گەورە فرە ژنی داناوە و حەلالی کردووە . وە خوای گەورە هەموو شتێکی چاك و پاکی حەلاڵ کردوە و هەموو شتێکی ناڕەواو پیسی حەرام کردووە ، کە ئەفەرموێ

﴿ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ ( ١٥٧ ) ﴾
الأعراف

لە کۆتایی داوامان سوپاسی خوای گەورە ئەکەم و داوای لێ بووردنی لێ ئەکەم لە هەموو تاوانەکانم

ڕۆژی دووشەم ١٩٩٨/١/٢٦

دایکی عبدالله

# بەشی یەکەم
# بەهاوسەر بوون

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (٢١) ﴾ سورة الروم.

خوای گەورە لەو ئایەتە پیرۆزەدا ئەفەرموێ : لە ئایەت و نیشانەکانی خودایە هەر لە خۆتان هاوسەری دروست کردوە ، هەتا پێوەی نیشتەجێ بن و خۆشەویستی و بەزەیشی لە نێوانتان داناوە ، ئەوەش بەڵگەو نیشانەیە بۆ ئەو کەسانەی بیری لێ ئەکەنەوە .

لێرەدا هاوسەرێتی داناوە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد پێوەی نیشتەجێ بێت و بحەسێتەوە و ووشەی ( لتسکنوا ) بەکار هاتوە کە ئەو گیانەی لە مرۆڤدایە وەك شتێکی مادەیی‌پێویستی بە نیشتەجێیی هەیە کە بەهۆی ئەو هاوسەرێتیە دا ئەکەوێت و پشوو ئەدات . وە پردی مانەوەی پێکەوەیی بۆ داناوە ئەویش خۆشەویستی و بەزەییە .

لای خوا ئاسانە کە ئادەمیزاد دروست بکات بەبێ پێویستی هاوسەرێتی ، وە پیشانمانی داوە کە دروست بوونی ئادەمیزاد هەر لە بنەڕەتدا بە ئادەم ( دروودی خوای لێبێت ) دەستی پێ کردوە کە لە خۆڵ دروست کراوە بێ پێویستی دایك و باوك . لە دوایدا پێغەمبەر عیسی ( دروودی خوای لێ بێت ) بەبێ جووت بوون لەدایك بوە و ئەوە بەڵگەیەکە بۆ ئاسانی ئەو دروست بوونە کە خوا پێویستی بەهیچ نیە لە دروست کردنی هەرشتێك کە بیەوێت ، بەڵام چ پەندێکی گەورەی تێدایە ! کە بە هاوسەربوون و جووت بوونە مانەوە کە هۆی زیاد بوونی مرۆڤە .

لەو پەندانە .. لە هاوسەرێتی خێزان دروست دەبێت .. لە خێزانیش هۆز و نەتەوە ، بەو هۆیە چەندەها پەیوەندی بەتین و ماف و ئەرك پەیدا ئەبێت .

لێرەدا پرسیارێك سەرنجمان ڕادەكێشێ .. ئایا ئەگەر خوای گەورە ئەو هاوسەرێتی‌یەی مرۆڤیش وەك ئاژەڵ دروست كردبایە .. هیچ بەزەیی و خۆشەویستی لە نێوانیاندا دروست نەبوایە .. ئایا ئەو جووتە ئادەمیزادە لەگەڵ ئەژیان ؟ .. خۆڕاگیر ئەبوون بۆ هەموو كەم و كوڕیەك لە نەخۆشی و نەبوونی و دووری لەو خێزانەی كەڵی هاتنە دونیا و پەروەردە بوون ؟

بەڕاستی ئەو خۆشەویستیە و بەزەییە شتێكی پیرۆز و گرانبەهایە و پێدراوێكی خوایە بۆژیان خۆش كردن و خۆڕاگرتن لەسەر تەنگ و چەڵەمە كە دێنە ڕێی خێزان و مانەوەی خێزان و بەوجۆرە دروست بوونی نەتەوە ...

جا لەسەر میللەت پێویستە ئەركی بە هاوسەربوون و ئەو گیروگرفتانەی دێنە ڕێ بۆ گەیشتنی دووكەس بخاتە ئەستۆی خۆی، خێزان بەردی بناغەی كۆمەڵە . ئێمەی كوردیش بە تایبەتی ئەبێ كاری چارەسەركردنی میللەتەكەمان بخەینە ئەستۆی خۆمان و هەوڵی پێشكەوتنی بدەین ، كە چەندەها ساڵە لە ژیانێكی پڕ تەنگ و چەڵەمە و ئاژاوە ئەژی ، زۆر جاریش لە مێژوو دووچاری قڕكردنی بە كۆمەڵی هاتووە . پێویستە هەوڵی زۆر بوون بدەین لە ژمارە بۆ جێ گرتنەوەی ئەوانەی ژیان لە دەست ئەدەن بەهۆی شەڕ و ناكۆكی و نەخۆشی وە لەهەمان كات بۆ زیاد بوونی ژمارەی گەنج و بەهێزبوونی میللەت و خۆپاراستن لەو هەموو دوژمنانەی كەلە هەموو لایەك دەورەی داوە .

بەڵام ئایا لەو سەردەمەدا خێزانی كورد بیر لەو هەموو لایەنە گرنگە ئەكاتەوە ؟

بەتایبەتی لە پاش ئەو هەموو ساڵانی گرانی .. شەڕ و ناكۆكی ناوخۆ .. كە میللەتەكەمانی كردە نەتەوەیەكی ژێردەست و سەر لێشێواو ...

هەر نەتەوەیەكیش بەو جۆرە بوو ناتوانێ خشتەی ژیان ڕێك بخات ..

بەڵام لەسەر ئێمە پێویستە هەوڵ بدەین تا بگەینە ئامانج و میللەتەكەمان لە ژێر دەستەیی دەربچێت .

ئەو پێشکەوتنە خێراییەی جیهان کارێکی زۆری کردە سەر نەتەوەکەمان چونکە ئەبینین هەموو نەتەوەیەك سەربەخۆیە ، تەنیا کورد بەو ژمارە زۆرەش و ئەو خاکە پرخێرو و بەپیتە کراوەتە چوار بەشەوە .

ئەمە وای لە هەندێك کەس کرد ،نەگەیشتنی بە ئامانجی و پاشکەوتووییەکەی هۆیەکەی بگێڕێتەوە بۆ ئاینی ئیسلامی پیرۆز و ڕێبازی خوا ... بەڵام نەخێر ..

پێشکەوتنی دەوڵەتانی خۆرئاوا لەپاش تاریکی و نەفامی و ناکۆکی زۆر بوو ... ئینجا هەوڵیدا کە بەداگیرکردنی و خێر و بێر خواردنی دەوڵەتانی جیهانی سێیەم ، کەلەت بوونی کوردستانی ئێمەش هەر ئامانجێکە لە هەوڵ دانی ئەوان لەسەر حیسابی میللەتانی تری جیهان بێت کە چەند نەبوونی و نەزانی ، شەڕێك بێت لەهەر دەوڵەتێك بێت ئەوا بازرگانی‌یە بۆ ئەو دەوڵەتە خوێن مژانە ..

وە لەهەمان کاتدا پێشکەوتنیان کارێکی یەك جار خراپی کردە سەر بیرو باوەڕوو ژیانی هاولاتی خۆیان بەگشتی . وای کرد کە پردی خێزان کەم بێت و هەندێ جار نەمێنێ ..

مادده بووە ئامانجێك بۆ ئادەمیزادێك کەخۆی بە قوربانی‌بکات ...

لەئەنجامدا بووە شەڕی دووبەرەکی لە نێوان بەرەی گیانییە پاکەکەی و بەرەی ماددەی لەخۆڵ دروست کراوی پێداویستی ئاژەڵی، ( الصراع بين الجانب الروحي و الجانب المادي في النفس الواحدة ) لەئەنجامدا بووە هۆی سەر کەوتنی ڕواڵەتی بەرە ئاژەڵیەکەی، بەڵام لە ناخەوە ئەو دووبەرەکیە هەر ماوە و نەمێنێ ، هەتا ڕادەیەك وای کرد مرۆڤ نارەحەت بێت و هەموو کات بیەوێت بەشە ماددەکە تێربکات . هەتا بحەسێتەوە بەڵام بەداخەوە نەخۆشی کەسایەتی و نەخۆشی ڕەگەزی وەك (ئایدز) و چەندەها نەخۆشی تر پەیدابوو وە لە زیادبووندایە . نەخۆشی دەروونی وای کرد کە خۆکوشتن پەیدابێت و گەلێك زۆریش بێت ... بەوەی کە منداڵ لە دامەزراوە میرییەکان بە کۆمەڵ بە خێو ئەکرێن و هەموو پێداویستیەکانی ژیانیان بۆ دابین ئەکرێ هەتا تەمەنێك .. لە دواییدا تەنیایی و هەوڵدان بۆ ژیان دابین کردنی پاشەڕۆژ دێتە ڕێیان و خۆیان پێ ڕاناگیرێ و گیروگرفتیان لە ناکاو دەست پێ دەکات و زۆر

دەبێ . لەوەش خێزان بەشێوەیەکی سەرەکی خەتابار نیە بەڵکو دەوڵەت کە بەهۆی پێشکەوتن و ئیشکردنی ئافرەت ، دەست بەسەرگرتنی هەموو خزمەتگوزارییەك . لە خێزانیان تێك داوە و توانیان دەست کاری مافی پەیوەندییەکانی مرۆڤ و خێزان بکەن و تێکیبدەن . مرۆڤ بە قوربانی ڕواڵەتی جوانی و پێشکەوتن بێت ، وای لێ هات مرۆڤ وەك ئاژەڵ بێ باوەڕ مایەوە باوەڕی بە سزاو پاداشت نەما ... هەموو هەنگاوێکی بۆ هەوڵ و دەستکەوتی دونیایە و تەنیا ژیانی کورتی سەر زەوی لە پێشە و ژیانی دوا ڕۆژی لە بیر خۆی بردۆتەوە کە بیانەوێ و نەیانەوێ هەر لە پێشیانە .. خوای گەورە ئەفەرموێ :

﴿وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ (٢٨١)﴾

سورەتی البقرە

واتە : پارێزگاری بکەن و لەخوا بترسن بۆ ڕۆژێك کە دەگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە و هەر چیتان کردبێ دێتە ڕێتان و خوای گەورەش زوڵم لەکەس ناکات .

لەو وولآتانەدا کە خێزان لە تێك چووندایە ، کاری بە زۆری لەسەر ئافرەت کرد وای لێ هات ئافرەت بووە شتێك کڕاو فرۆشرا ئافرەت خۆی کردە ڕێخۆشکەر ( وسیلە ) بۆ گەیشتن بە هەرشتێك کە بیەوێت و ئایندەی خۆی پێ دابین بکات و هیچ پایە و شکۆمەندی و ڕێزی نەما ... لە ئەنجامدا منداڵی بێ دایك و باوك زۆر بوو ، بەزەیی و مرۆڤایەتی نەما .

کەواتە مرۆڤ خۆی کردە قوربانی پێشکەوتنی مادە و ڕواڵەتی و سۆز و خۆشەویستی لە پێناویدا لەدەست دا. لە هەمووی دڵ تەزێن تر و ناخۆش تر و هیوابڕتر ... ڕۆی خواو پاداشت و سزای لەبیر خۆی بردەوە - ﴿ انا لله و انا الیه راجعون ﴾ .

وەبەڵگەش بۆ مانی ناوەڕۆکی فیترەی پاك ئەوەیە کە مرۆڤ بۆشایی سۆزو خۆشەویستی و گیانی پڕ بکاتەوە بە پەیوەندی لەگەڵ ئاژەڵدا ...کە هەریەکێك سەگێك یان پشیلە بەخێو دەکات هەموو خۆشەویستی دڵی خۆی ئەداتە ئەو ئاژەڵە .

بەڵام بەداخەوە گەلێك كەسی نەزان ئەو هەموو پێشكەوتنە ماددیەی بەستۆتەوە بە سەربەخۆی ئافرەت و بەرەڵڵایی ، پاش كەوتنی ئێمەش ( كەهۆی تەمبەڵی و نەزانی یە ) كردۆتە هۆی ئاینی ئیسلام و داپۆشین و پاشكەوتنی ئافرەت .

ئایا قورئانی پیرۆز و فەرمودەی پێغەمبەر ( درودی خوای لێ بێت) هیچ هانی نەخوێندەواری و پاشكەوتن دەدەن ؟!....

بە پێچەوانەوە بەڵكو یەكەم جار كە وەحی بۆ پێغەمبەر دابەزی فەرمانبوو لە خواوە بۆ خوێندن ...

خوای گەورە ئەفەرموێ :- ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢) اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ (٥) ﴾

سبحان الله :- یەكەم ووشە لە خواوە بۆ ئادەمیزاد بخوێنە!... بخوێنە بە ناوی خوا ئەو خوایەی هەموو شتێكی دروست كردوە . ئادەمیزادی‌دروست كردوە لە پارچەیەك خوێنی خەستی بەرەحمەوە نوساو . بخوێنە كە خوای پەروەردگارت و داهێنەر هۆی زانینی كردۆتە پێنووس . وە ئادەمیزادی لە نەزانیەوە زانا كردوە ...

هەندێ خێزان لەبەر لێكدانەوەی چەوت ، دەیەوێت لاسایی رۆژئاوایی بكاتەوە بۆ هەڵبژاردنی ژیان نەك لە پێشكەوتن و زانین نەخێر ... بەڵكو لە ڕەواڵەت و خۆ دوور كردنەوە لە بیرو باوەڕ ... بەڵام ناتوانێ تاسەر بێت و خۆی ڕاگرێ لە ئەنجامی ڕێگەكەی بۆ نموونە ئەو منداڵانەی سەربەخۆ ئەكات لە رەواڵەت و جل و بەرگ بەتایبەتی كچەكە كە گەیشتە ئەوەی ئەو كچە یان كوڕەكە چەوتیەك بكات ئەوە سەركۆنەی ئەكەن هەوڵی بۆ دەدەن .... هەتا پلەیەك كە دایك و باوك خۆی بە قوربانی ڕۆڵەكەی دەكات . ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر دروست بوونمان و بیركردنەوە و باوەڕمان ... كە پەیوەندی خێزان بەتینە . دڵی دایك و باوك بە ڕۆڵەكانیانەوە .. سۆز و خۆشەویستی هەیە بەرامبەر بە منداڵ هەوڵ دانی مرۆڤ بۆ خۆی و دەوروپشتیەتی لە خێزان و دایك و باوك و كەسانی تر كە بەخێوكردنیان لە سەر شانی بێت .

# ڕێگای ئیسلام بۆ دروست کردنی خێزان

ئیسلام : واتە مل کەچ کردن بۆ دەستووری خوای گەورە لە هەموو پەیڕەوو پرۆگرامی ژیان ، دروست کردنی خێزانیش کە بە بەردی بناغەی ژیان دادەنرێت دەبێ لەسەر دەستووری ئاینی ئیسلامی پیرۆز بێت .. ئەی ئەگەر دەست پێ کردنی ژیانی وەچەی نوێ لەسەر بناغەی ئیسلام دانەنێین ئەی چۆن ئیسلام دەکەینە ڕێبازی ژیان ! کە بەهاوسەربوون بە نیوەی ئاین دادەنرێ و لە هەمان کاتدا ئایندەی مرۆڤ لە وێوە دەست پێ دەکات .

خێزان دروست کردن بۆ ڕۆڵەکان و یارمەتی دانیان ئەرکە (فرض)ە لەسەر شانی هەموو دایك و باوکێك کە لەسەر ڕێبازی ئیسلام بژین . چونکە ئەگەر بێتوو هەر دایك و باوکێك هەست بە ئەرکی سەرشانی خۆی نەکات لە ئاسان کردن و دروست کردنی خێزان بۆ ڕۆڵەکانیان یاخود بوونە کۆسپ و تەگەرە لەپێش ئایندەیان ئەوا پاش چەند ساڵێك مناڵێکی بچووك نامێنێ ... یان گەنجەکان تووشی تاوان و زینا دەبن و منداڵی نا شەرعی پەیدا دەبێت . پێویستە لە سەر دایکان و باوکان هەوڵ بدەن بۆ دابین کردنی ئایندەی منداڵەکانیان وەك هەوڵ دانیان بۆ هەر لا یەنێکی تری ژیانیان .ئەو کەسانەی لە خوا ئەترسن و چاویان لە پاداشتی خوایە خۆیان ئامادە ئەکەن بۆ ڕۆژی دوایی پێویستە لەسەریان هەوڵ بدەن بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوای گەورە و گێڕانەوەی حوکمی خوایی بۆ ناو ئادەمیزادەکان چونکە هیچ دەوڵەتێك لەسەر ڕووی زەوی نیە لەم سەردەمە حوکم رانی ڕێبازی خوا بکات . چونکە ئەگەر ئیسلام دەسەلات داربێت ئەوە گیروگرفتی خێزان دروست کردن هەر نامێنێت ... بەلام هەتا ئەو کاتە ... ئێمە لەسەرمانە هەر کەسێ لە شوێنی خۆی و بەپێی توانای خۆی ڕێبازی ئیسلام بچەسپێنێ لەسەر خۆی و ئەو کەسانەی بە خێویان دەکات . ئێمەی کوردیش کە ٩٠٪ و زیاتری موسڵمانین ئەبێ هەوڵ بدەین بۆ دەستووری خواو جێبەجێ کردنی لە ژیانماندا .

پێغەمبەر ( درودی خوای لە سەربێت ) دەفەرموێ :-

﴿ كلكم راع و كلكم مسؤول عن رعيته ﴾

واته : هەمووتان شوانن و هەمووتان لێ پرسراون لە کۆمەڵەکەتان کە شوانێتی دەکەن ... لەسەر خێزانی موسڵمانیش پێویستە ڕۆڵەکانی لەسەر ڕێبازی ئیسلام بەخێو بکات و لەکاتی پێ گەیشتنیان بەسەر بەرزی یارمەتیانبدەن بۆ دروست کردنی خێزان لەسەر بنەڕەتی ئیسلام .

ئابڵۆقە لەسەر ژیانیان دانەنێن و ڕێگای بە هاوسەربونیان لێ نەگرن و نەبنە هۆی تاوانکردنی ڕۆڵەکانیان .

ئەوپاکیەی ڕۆڵەکانیان بەهەل نەزانن و بە قوربانی بیرکردنەوەی چەوتی خۆیان نەکەن !بەڵام بەداخەوە زۆر لە ڕەوشتی ئاینی ئیسلام بزربوە و چەوتی ونەزانی جیٚ ی گرتووەتەوە هەر لەبەر ئەوەشە هەریەکێك ئەتوانیٚ دژی ئیسلام بدویٚ و ڕەخنە لە ژیانمان بگرێت ، بەبەستنەوەی بە ئاینی راستی ئیسلام ، خۆی هەڵکێشیٚ بەبیٚ ئەوەی بزانیٚ ئەو ڕەوشت و نەریتە لە ئیسلام بەدوورە .

بەتایبەتی کێشەی ئافرەتی کردۆتە نموونەیەکی زۆر باش بۆ هەڵسان بەسەرماندا ، کە ئەوان لە ئێمە باشتر دەزانن ئێمەی ئافرەت بە شێکین لەو کۆمەڵە دیلە پاشکەوتووە و هۆی پاشکەوتنمان دەگەڕێتەوە بۆ پاشکەوتنی کۆمەڵ . نەك بە پێچەوانە وە کە کۆمەڵ هۆی پاشکەوتنی ئێمەبێت . لەبەر ئەوە پێویستە ئەو دەنگە لە ئێمەوە بێت بۆ دەم کوت کردنی ئەو کەسانەی کە هەوڵ ئەدەن لەسەر ڕێگای چەوت و ئەیانەویٚ لە ئێمەی ئافرەت تێك بدەن .

ئێمەی ئافرەتی کوردی موسڵمانیش داوای مافی ڕەوای خۆمان دەکەین و هەوڵ ئەدەین بۆ کۆمەڵ بەگشتی و ئافرەت بە تایبەتی ... بەڵام لەسەر ڕێبازی ئاینی ئیسلام ... دەبیٚ لەسەر هەوڵدان سووربین پاشگەز نەبینەوە . ئێمە دژی کۆمەڵ نین و باری قورس تر ناکەین ، بەڵکو ئەبیٚ لەگەڵ کۆمەڵەکەمان هەوڵ بدەین کە بەشێکین لەو کۆمەڵە .. بەڵکو ئافرەت بە چاووگ دائەنریٚ بۆ بوونی نەتەوە و مانەوەی ... ئایا ڕەوایە ئێمە داوای پێشکەوتن و سەربەخۆیی بکەین لەو کۆمەڵە دیلە پاشکەوتووە ؟! بەڵام ( فاقد الشئ لا يعطيه ) واتە یەکێك شتێکی نەبێت ناتوانێت بیدات .

بەلام بەپێی توانا داوای ئەو مافە ئەکەین کە خوای گەورە بۆمانی داناوە هەولدانمان بۆ ژیانی بەرەلایی نیە .. بۆ لەدەست چوونی ژیانی ئاسوودەیی سەرزەوی و ژیانی ڕۆژی دوای نیە ...

هەولْ دانمان بۆ دابین کردنی ڕێبازی ئیسلامە بۆ ژیانی منالْ و بچووك و گەنج و دایك و پیر و بۆ ژیانی ڕۆژی دوایی و بەهەشتیشە .

پێغەمبەر ( درودی خوای لێ بێت ) دەفەرموێ :-

﴿ یا معشر الشباب، من استطاع منكم الباءة فليتزوج، فانه اغض للبصر وأحسن للفرج، ومن لم يستطع فعليه بالصوم، فانه له وجاء ﴾

واتە : ئەی گەنجەکان ، ئەوەی توانای ژن هێنان و بەخێو کردنی هەیە ، با ژن بێنێ ، چونکە ژن هێنان ئەی پارێزێ لە تەماشاکردن و لە تاوانی گەورە دووری دەخاتەوە ئەوەی ناشتوانێ ژن بێنێ ، بابەڕۆژوو بێت بەڕۆژوو لە تاوان دووری دەخاتەوە و خۆڕاگری دەکات ژن بەخێوکردن و خێزان دروست کردن ، ئەرکی سەرشانی پیاوە . ئەو گەنجەی کە دەیەوێت ژن بێنێ دیارە داینـاوە چۆن بەخێوی بکات . ئەو بارەی پێ هەلدەگیرێ . لەهەمان کاتدا ئەو گەنجەی کە ژن دێنێ دەیەوێت لە تاوان دوور بکەوێتەوە و نیوەی ئاینی تەواو بکات خێزانێکی ئاسوودەو بەختیار دروست بکات ... ئەو گەنجە هەلدەستێت بە نیشان کردنی یەکێك کە داوای بکات ئەوەش بە گوێرەی بۆچوونی ئەو گەنجە . کە پێغەمبەر ( درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :

﴿ تنكح المرأة لأربع: لمالها، ولحسبها، ولجمالها، ولدينها، فظفر بذات الدين تربت يداك ﴾ رواه البخاري و مسلم .

واتە : ژن دەخوازرێ لەبەر چوارشت : لەبەر سەرمایەی یان لەبەر بنەماڵی یان لەبەر جوانی یان لەبەر ئاینی و باوەڕی ، ئینجا خاوەن ئاینەکە بخوازە گەروات نەکرد دەستت بە هیلاك دەچێ ) بۆ چوونمان بۆ ئەو فەرموودە پیرۆزە ئەبینین هەرسێ هۆیەکە تەنیا ئاین نەبێت دەتوانین بلێین بۆ ماوەیە ، هیچ هەولدانی کچەکەی تیانیە و

هیچ له بیری کچەکە پیشان نادات ، تەنیا ئاین نەبیٰ کە دیارە ئەو کچە بیرکردنەوەی راستە خوای گەورە ڕیٰی ڕاستی پیٰی نیشان داوە و ئەو کچە بەزانا دادەنریٰ بە پیٰچەوانەی یەکیٰکی تر کە خاوەن سەر مایەو یان ڕەگەزەوو بنەماڵەی ناودار ویان جوانە بەلاّم باوەڕی نەبیٰت ئەوا بە پیٰوانەی باوەڕ ئاین نەزانەو تیٰ نەگەیشتووە و بیرکردنەوەی چەوتە خودای گەورە ( جلّ وعلا ) ئادەمیزادی بیٰ باوەڕی بەکەرولاڵ و کویٰر داناوە کە ناگەڕیٰنەوە بۆ باوەڕ . کە لە سوورەتی ( البقرە ) ئایەتی (١٨) دەفەرمویٰ : ﴿ صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ (١٨) ﴾

ئینجا پیٰغەمبەر ( دروودی خوای لەسەربیٰ ) بۆیە ئامۆژگاری گەنجی کردوە کە خاوەن ئاینەکە بیٰنیٰ ئەوە جیٰگای هیوایە و منالی باشی پیٰ پەروەردە دەکریٰ .

**بیرکردنەوەی کچ و خیٰزانەکەی کاتی بەشوودانی لە ئیسلامدا :**

بیٰگومان کچیش بیرکردنەوە و بۆچوونیٰکی هەیە کاتیٰ بە پیاویٰك ڕازی دەبیٰ ، بەلاّم لەسەر کچ و خاوەنەکەی پیٰویستە لەسەر ئاینی ئیسلامی پیرۆزدا بیر بکەنەوە و بە ئامۆژگاری پیٰشەوامان محمد (درودی خوای لەسەر بیٰ ) بکەن کە فەرموویەتی :

﴿ إذا أتاكُم مَن تَرضَونَ دينَهُ ، إلا تفعَلوا تكُن فتنةٌ في الأرض وفَسادٌ كَبير ، قالوا يا رسول الله وإن كانَ فيهِ ؟ قالَ إذا جاءكُم مَن تَرضَونَ دينَهُ وخُلقَهُ فانكحوهُ (ثلاث مراتٍ) ﴾ رواه الترمذي

واتە : ئەگەر یەکیٰك بۆ داخوازی کچتان هات کە یاخود بۆ داخوازی کەسیٰکتان هات کە ئیٰوە سەرپەرشتیاری بوون کە لە ئاین و ڕەوشتی ڕازی بوون ئەوا کچی بدەنیٰ سیٰجار دووبارەی کردەوە ....

سبحان الله : بەڕاستی فەرموودەیەکی پڕ مانایە ، لیٰك دانەوەیەکی زۆر گرنگی هەیە بۆ یەکیٰك کە بیری لیٰ بکاتەوە . یەکەمیان فەرمانە لە پیٰغەمبەرەوە بۆ موسڵمانان کە دەبیٰ لەسەری بڕۆن . بەو فەرموودەیە دیارە ئەو گەنجەی کە توانای ئەوەی هەبوو

لەسەر ئاین و بیر و باوەڕ بێت و خوو ڕەووشتی خۆی چاك بكات بەو پێیە . هەوڵ دانی بەرەو چاكی و بەرزیە . ئەو كەسە بەسەر كەسایەتی خۆی زاڵ بوە گرنگترە لەوەی هەوڵدانی بۆ تێر كردنی ئەو خودەیە و بەهیچ شتێكیش تێر نابێت ، بەمەرە بۆ ئەوكەسەیە دڵو چاوی پڕبێت لە باوەڕ نەك چاوبرسی بێت بۆ شتی دونیایی و كەسایەتی خۆی بەسەریا زاڵ بێت دوور كەوێتەوە لە ڕەووشتی بەرزی مرۆڤ . لەهەمان كاتدا لەپاش ئامۆژگاری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) كە بەشێوەی فەرمان هاتووە هەڕەشەی كردوە لە یەكێك تێبگات كە نەدانی كچ ئاژاوە دروست دەكات لەسەر زەوی ..!

كە خێزان وا هەست دەكات كە زۆر ئاسانە بڵێتە كوڕێكی باوەڕ دارو ڕەووشت بەرز كچت نادەمێ .... بەڵام نەخێر بەڵكو بەو ووشەیە دەبێتە یەكێك لە ئاژاوە چیەكانی سەرزەوی تێكدەرەكانی زەوی لەگەڵ ئەوەشدا كە خۆی وا هەست ئەكات هیچ تاوانێكی نەكردوە.

ئەو تاوانە گەورەیە ، بۆ كەسێك بیەوێت لەسەر زەوی چاكە بڵاو بكاتەوە و ئاژاوەبكوژێنێتەوە بۆ كەسێك كە بزانێ تەگەرە خستنە سەر ڕێی كچ مانای ئەوەیە ئاژاوە بڵاو دەبێتەوە و سەر زەوی تێك دەچێت .

دەبێ ئەو تاوانە لەسەر تەرازوو چەند گران بێت ؟...

ئەو گەنجەش كە ئەیەوێت لە تاوان بەدوور بێت وداوای كچ ئەكات بێ گومان لەپاش ئەوەی كچەكەو كوڕەكە یەكتریان بەدڵە و ئەیانەوێ خێزان دروست بكەن لەسەر بنەڕەتی ئاینی ئیسلامی پیرۆز . ئەو خێزانە ئەبنە تەگەرەو كۆسپ لەسەر ڕێگای دین و دونیا ... خۆیان تووشی تاوانێكی گەورە دەكەن پێشیان ئاسانە .

بەداخەوە .. ئەگەر كەمێك بیر لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ)بكەنەوە ناتوانن وا بەئاسانی ئەو گەنجە بگەڕێننەوە و دەرفەت لەدەست ئەو كوڕە موسڵمانە كەم بكەنەوە و بەرەنگاری ئاژاوەی بكەن و وای پیشان بدەن كە سەرمایە شتێكی گرنگترە لە باوەڕوڕەوشت چونكە بەڕاستی هەر خێزانێك كە بە

گەنجیك رازی‌یە یان نە لەپاش خووڕەوشتی باش و باوەرداری بێ گومان سەرمایەکەیەتی ...!

کەواتە ئەو خێزانە بۆتە پارەپەرست ! وە پارەپەرستیش ئەکەنە شتێکی رەواو ئاسان . نەك بە تاوانیکی گەورە تەماشای بکەن ... کە گرنگە خۆی لە هاوتا پەیاکردن بدات بۆ خوای تاك و تەنیا ... وە دەرچوونە لە فەرموودەی پێغەمبەر ! والله اعلم .

ئەبینین دایك و باوك لەپاش ئەو هەموو ژیانە و تاقیکردنەوە و بەسەرهاتەی کە بەسەریان هاتووە ئەبێ چاو کراوە بووبن و بزانن خۆشی ژیان بە پارە زۆری نیە . بەلام لە جیاتی ئەوەی بیرو هۆشدارترین ئەبن بە پارە پەرست و بێ بیرو هۆش و نەزان . ئەبنە خراپترین پێشەواو ری نیشاندەر بۆ رۆلەکانیان . بۆیە ئەو گەنجەش وای لی دیت پارەپەرست بیت و واتی بگات کە پارە گرنگترە لە باوەر و رەوشتی بەرز ... بەراستی تاوانیکی گەورەیە و زۆر داریە ... کە لە گەنجیك تیك ئەدەن و ری‌ی چەوتی پی نیشان ئەدەن .

بناغەیەکی دوور لە ئایین بۆ رۆلەکانیان ، بە پیوانەی دونیای ئەو هاوسەریتی‌یەی کە ری‌ی خوا پیرۆزی کردوە و بەنیوەی ئاین دانراوە بەزۆرداری دەستی پی دەکەن . بەو جۆرە پیشەوای خراپ و چاولی‌گەری دروست دەبیت بۆ ریبازی بی باوەر ... شەیتانیش ئیشەکانیان ئاسان دەکات و زیاتر بەرەو خراپەیان دەبات . گەنجەکانیش بە هیوای هاوسەریتی دەمیننەوە و هەشە خۆی پی راناگیری لە ئاژاوە و ئەکەویتە شەریکی دەروونی و دەبیتە دژی کۆمەل و رەنگە لی‌ی تیك بچیت و تووشی تاوان ببیت ... ئەی خیزان هۆی ئەو تاوانە نیە ؟ ئەی ئەوانیش هاوتانین لەو تاوانە ؟ ...

بەتایبەتی لەپاش ئەوەی هەموو دەرویشت یارمەتی ئاسان کردنی تاوان دەدەن و ئاژاوە دەنینەوە .

خوای گەورە ئەفەرموێ : ﴿ وَأَنكِحُوا الْأَيَامَىٰ مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِن يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴾

الأيامي : جمع أيم ، وهو الذي لا زوجة له ، أو التي لا زوج لها

العباد : العبيد

واتە : بە هاوسەری بکەن ئەو کەسەی بێ هاوسەرە لەژن و لە پیاوو . وە بەندەکانیش بە هاوسەر بکەن . ئەگەر هەژاریش بوون ، خوای گەورە دەوڵەمەندیان ئەکات وە خوای گەورە زانایە و ئاگای لە هەموو شتێکە ... کەواتە خوای فەرمانی داوە بۆ هەمووان کە هەوڵ بدەن بۆ بەهاوسەرکردنی بێ هاوسەرەکان . وە خوا خۆی ئەزانێ مرۆڤ بیر لە چی ئەکاتەوە لەبەر ئەوە فەرموویەتی ئەگەر هەژاریش بوون ... چونکە تەنیا دەوڵەمەندی سەرنجی خەڵك ڕادەکێشێ .... ئەگەر هەژاریش بوون .. چونکە نابێ ببێتە هۆی نەگەیشتنی دوو کەس کە دڵیان بەیەکەوەیە . خوا ئازووقەی بۆ هەموان داناوە ... دیسان ئەوکەسانە دڵ خۆش ئەکات و باوەرداران دڵنەداتەوە بەوەی ئەو دووکەسە دەوڵەمەند ئەکات و ئازووقەیان لەدەست خوایە ... وە ماناکەشی لەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (د.خ) دەردەکەوێت کە فەرموویەتی :

﴿ ثلاثٌ حقٌ على الله عونُهم : المجاهدُ في سبيل الله ، والمكاتب الذي يريدُ الاداء ، والناكحُ الذي يريدُ العفاف ﴾ رواه الترمذي

واتە سێ کەس مافی یارمەتیان هەیە لە خواوە ، ئەو کەسەی هەوڵ دەدات (جیهاد) دەکات بۆ ڕێی خوا ، ئەوکەسەی ئەیەوێت لە کۆیلەیی دەربچێت ، ئەوکەسەی ئەیەوێ ژن بێنێ و بە پاکی و بێ تاوانی بژین .

لەدوای ئەم ئایەتە خوای گەورە فەرموویەتی ﴿والله سميعٌ عليمٌ﴾ واتە زانینی خوا سنووری نیە کە ئەورێبازەی داناوە بۆ سوودی مرۆڤایەتی ئەگەر لەسەری بڕۆین سوودبەخش دەبین .... وە هانی باوەر داران ئەدات کە هەوڵی بە هاوسەربوون بدەن و بۆ خۆیان و گەنجەکانی دەوروپشت ئایا دڵ شکاندنی ئەو گەنجە کە بۆ خزمایەتی و نزیك بوونەوە هاتووە تاوان نیە ؟.. بەڵێ تاوانێکی گەورەیە لەهەموو بارێکەوە لەوانە

: ڕێی ژیانیان لێ گرتووە و نایەڵن ئاییندەی خۆی بنیات بنێ ... وای لێدێ ئەو جگە گۆشانە بەرامبەریان بێ شەرم بن و هەموو هیلاکی دایك و باوکیان لەبیر بچێتەوە رقی لێیان هەڵ بستێ و هیوای نەمانیان بۆ بخوازێ ئەوەش تاوانێکی ترە کە خوا گەورە فەرموویەتی :

[ وقضى ربك ألا تعبدوا إلا إياه وبالوالدين إحسانا إما يبلغن عندك الكبر أحدهما كلاهما فلا تقل لهما أف ولا تنهرهما وقل لهما قولا كريما (٢٣) ﴾ سورةتی الاسراء

واتە : خوای گەورە دای ناوە و ( واجب )ی کردووە لەسەرمان بیپەرستین لەگەڵ دایك و باوکماندا چاکە بکەین ، ئەگەر یەکێکیان یان هەردووکیان پیر بوون پێیان نەڵێین (ئۆف) وقسەیان پێ نەڵێین، لەگەڵیان بەبەزەیی بدوێین و بجوڵێینەوە داوای بەزەیی خوایان بۆ بکەین لە خوای گەورە .

بەڵام ئایا ئەو ئایاتە ئەو دایك و باوکە ئەگرێتەوە کە ئەبنە هۆی ژیان تێك دانا ڕۆڵەکانیان و ڕێیان لێ دەگرن و ئەبنە کۆسپ لەڕێی ئاین و دونیایان ؟...

ئایا ئەو کورو کچە ، خۆشەویستیان بەرامبەر ئەوان دەمێنێ ؟ دەتوانن بە نەرمی لەگەڵیان بجوولێنەوە ؟ ( بەتایبەتی کە منال بەرامبەر دایك و باوك هەر خۆی بەزەیی کەمە ) . لەبەر ئەوە نابێ دایك و باوك ڕێی خراپ لە ڕۆڵەکانی بکاتەوە و بی چەوسێنێتەوە چونکە چەوساندنەوە مرۆڤ بێ شەرم دەکات . کە پێشینان وتوویانە ( گۆزە کەپربوو لێی دەرژێ ).

بەراستی ئاژاوەیەکی گەورە ئەکەنە پێش ئەو گەنجە هەر خوا یارمەتی بدات لە دەرچوونی و ڕێگای ڕاست بە هەموان پێشان بدات .

زۆر جار خێزانی دەوڵەمەندو سەرمایەدار ڕێگا لە کچیان دەگرن و دەیانەوێ یەکێك داوای کچەکەیان بکات سامانداز بێت . ئەوە چی ئەگەیێنێ ؟ چاوو برسیتی و پارە پەرستی ئەو خێزانە پێشان ئەدات . دەبوایە سامانداری مرۆڤ چاوتێر بکات بەڵام بەپێچەوانەوە . زیاتر چاوبرسی ئەبن و جگەر گۆشەی خۆیان بە قوربانی

سەرمایەو سامانیان دەکەن و ڕێی خۆشی و دامەزراندنی لێدەگرن و بەوشێوەیە ڕێزو شکۆمەندی بەشتی دنیایی دەگۆڕنەوە .

لەهەمان کاتدا ئەگەر ئەو کچ و کوڕە بەیەك ڕازی بن و دڵیان بەیەکەوە بێت ڕەنگە بە نەدانیان خێر لە خۆیان نەبینن و هەر چاویان لەسەر یەك بێت ز

ئەبێ دایك و باوك و لێپرسراوی کچەکە زیاتر بەزەییان بە ڕۆڵەکانیان بێتەوە و ڕێیان بۆ ئاسان بکەن . پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی ﴿ إرحموا مَن في الأرضْ يَرحَمْكُم مَن في السَماءْ ﴾

واتە : بەزەییتان بە گیانداری سەر زەوی بێتەوە . لە ئاسمانەوە بەزەییتان پێتان دێتەوە و ڕەحمتان پێ دەکەن ئەوەیش خۆشەویستی خوایە بۆتان ، پێویستە لە سەرمان دەبێ بەزەییمان بە خەڵکی تربێتەوە وە ڕۆڵەی خۆشمان لەپلەی یەکەم دابنێین بۆ خۆشەویستی و بەزەییمان . نەك ئەو خۆشەویستیە ببێتە خۆپەرستی ، لەبەر چەوتی بیرکردنەوە و بۆچونمان ، ئایندەیان لێ تێك بدەین . زۆر جار باوك دەبێتە پارێزەر لەسەر کچەکەی بێ ئەوەی کچەکەی پێی خۆش بێت ، وە ئەو پارێزەرە بۆ ماف سەندن نیە بەڵکو بۆ زۆرداریە . کە ئەو کچە ناداتە ئەوگەنجەی کەکچەکەی پێی خۆشە ... ئایا ئەو باوکە لەبەر کچەکەیەتی یان لەبەر خۆیەتی! نەخێر لەبەر هیچیان نیە بەڵکو ئەو کچەی گەر نەشداتە ئەو گەنجە نەیداتە یەکێکی تر کەلەپاشان ئەو گەنجەی دواییش گەر بزانێ کچەکە یەکێکی تری بەدڵ بووە ، نایەوێ و لە هەمان کاتدا مەمنونی ئەو باوکە نیە کە ئەو کچەی ڕاگرتووە بۆی . ئەگەر بێتوو ئەو باوکە هەندێ پرسیار لە خۆی بکات بەبێ خۆبەگەورە زانین و لەسەر ڕێگای ئاین ئەوا دڵی نەرم دەبێت .

لەو پرسیارانە : پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی :

﴿ لايؤمن أحدكم حتى يُحبَّ لأخيه ما يُحِبُّ لِنفسِهِ ﴾ رواه البخاري

واتە :کەسێك باوەڕدار نابێت هەتا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشەبۆ برای موسڵمانی پێی خۆش نەبێت . وە ﴿ إنما المؤمنونَ إخوةٌ ﴾ واتا هەموو باوەڕ داران

بران که کچەکەی خۆشی دەگریتەوە و ئەو برا موسلمانەش دەگریتەوە که پێی خۆشه لەگەل کچەکەیان خیزان دروست بکات . هەروەك چۆن ئەو دایك و باوکەش هەر به هاوسەربوون خیزانیان دروست کرد و خواش ئەو منالانەی داونەتی .

ئەو دوو گەنجه لەسەر بنیاتی ئاینی ئیسلام و تەواو کردنی نیوەی ئاین و جی بەجی کردنی ریگای خوا و بۆ مانەوەو زیادبوونی مرۆڤ لەسەر رووی زەوی گەیشتوونەته یەك و پییان خۆشه خیزان درووست بکەن .

پیغەمبەر (د.خ) به هاوسەر بوونی داناوه به نیوەی ئاین که ئەفەرموی :

﴿ من رزقه الله إمرأة صالحة فقد أعانه على شطر دينه، فليتق الله في الشطر الباقي ﴾

واته :هەر پیاویك خوای گەوره ژنیکی باشی پی بەخشی بیت ، ئەوا یارمەتی داوه لەلایەکی ئاینەکەی و باخوا پەرستی بکات لەلایەکەی تری .

دەبی دایك و باوکی موسلمان بزانن که تاوانیکی گەورەیه نەدانی کچ ( بی گومان پاش ئەوەی کچەو کورەکه یەکتریان چوه دل چونکه دەبی بەیەك رازی بن و یەکتریان دیبیت) که دایك و باوك وەچەی نوی که نەوەیه رای ئەگرن که خوای گەوره ئەفەرموی :

﴿ والله جعل لكم من أنفسكم أزواجا وجعل لكم من أزواجكم بنين وحفدة ورزقكم من الطيبات (٧٢) ﴾ سورەتی نحل

واته : خوای گەوره له خۆتان هاوسەرەکەی داناوه . هەر لەو هاوسەریتیه مندال و نەوەتانی بۆ داناوه ، ئازووقەی خۆش و حەلالی پیتان بەخشیوه . کەواته که خوای گەوره ئەوەی داناوه هەر لەگەل مندال وەتەواوکەری خیزان . من لەو ئایەته واتی دەگەم که خیزان و خەم خۆری ئەو گەنجانه که ناهیلن و یارمەتی دروست کردنیخیزانیان بۆ نادەن ،لەبەر هۆیەکی ناسەرەکی دونیایی ، ئەوا دەبنه هۆی براندتەوەی خیزانەکەی خۆیان و نەوەیان ،ئەمەش هۆکارەکەی گشتییەو دەگەریتەوه

بۆ هۆی بەهاوسەر نەکردنیان وەیان بەوەی ئەو کچە ڕائەگرن و تەمەنی منداڵ بوونی لە دەست ئەدەن ...

خوای گەورەش فەرموویەتی :

﴿ وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَاقٍ نَحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْئًا كَبِيرًا (٣١) ﴾

سوورەتی الاسراء

واتە : منداڵتان مەکوژن لەترسی برسیەتی ، خوا ڕزقیان ئەدات و ڕزقی ئێوەش بە ڕاستی منداڵ کوشتن گوناهێکی گەورەیە .

وادیارە کە ئێوە ناهێڵن ڕۆڵەکانتان لەترسی هەژاری خێزان دروست بکەن چۆن زیناکەم ئەبێ وە یان ئەبێ وە یان نامێنێ ؟ ئایا ئەم ئایەتەی سەرەوە ئاماژە بەوە ناکات کە هەژاری و بێ دەرامەتی هۆیەکی سەرەکی نی یە بۆ پێك نەهێنانی خێزان و ژیانی هاوسەریەتی ؟ بەڕاستی ئەمەی بڕیاری بۆ ئەدەن و پشتگیری ئەکەن بۆ بڵاوبوونەوەی کارێکی خراپە .

ڕاستە دەسەڵات و دەوڵەمەندی خۆشە بۆ ژیان خۆش کردن بە حەڵاڵی بەڵام کە بووە ئامانجێك بۆ هەوڵ دان و بیرکردنەوە و ناخۆش کردنی ژیان و نارەحەتی ، پێویست نیە . پێویستە پارەداری و سەرمایە ببێتە چاوتێری و خاوەنەکەی ببێتە پێشەوایەکی باش نەك چاوبرسێتی و بڵاوکەرەوەی خراپە .

چونکە هەموو کات مرۆڤ حەز ئەکات چاو لە پێشەواکان بکاتەوە بە تایبەتی ئەوانەی زۆر لەڕێکانی پێغەمبەر نازانن لەژیاندا لەبەر ئەوە چەند پێشەوا ڕێ‌ی ڕاست بگرێ ئەوا کۆمەڵ ڕێ‌ی ڕاست دەگرێ .

لەهەمان کاتدا ئایا بە ئاسانی ڕێك دەکەوێت کە ئەو گەنجە باوەڕدارو ڕەوشت بەرزە دەوڵەمەند و دەسەڵاتداریش بێت وە چەندەها شتی تریش!

بۆ ڕازی بونی دایك و باوکی نەزان و تێ نەگەیشتوو خۆپەرست؟! ...

پێویستە بیرکردنەوەی دایك و باوك کەمێك نزیك بێت لە بیرکردنەوەی ئەو سەردەمەی ڕۆڵەکانیان هەتا لێ یان تێ بگەن ...

- زۆر خیزان هەیە ! دانەمەزرانی منالەکانی ئەگەڕێنیتەوە سەر چارەنووس ( قسمەت و نسیب )

- ئەو کەسانە مانای چارەنووس نازانن ! پشت ئەکەنەوە لە خوا (التواكل) . واتە دەبی بزانن هەر هەموو شتیك لای خوا نووسراوە و کیش و پیوکراوە . وە خوای گەورە ئەزانی وە دای ناوە چ روو ئەدات لەسەر زەوی پان و بەرین چی تیایە . هەر گەلایەك بەر ئەبیتەوە لە دارو هەر میرووییەك ئەمری خوای گەورە بە ژمارە دای ناوە . هەرمندالیك کە گیانی دیتە بەر لە سکی دایکی خوای گەورە فەرمان بە فریشتە ئەکات کە ئازوقە و تەمەن و چی بەسەردیت و بەهەشتیە یان دۆزەخی بۆی دابنیت . بەلام ئیمە نازنین لە سەرمانە هەول بدەین و داوا لە خوای گەورە بکەین . کە خوای گەورە ( جل وعلا ) ئەفەرموی :-

﴿قل لن يصيبنا إلا ما كتب الله لنا﴾ واتە هیچمان بەسەر نایی تەنیا ئەوەی خوا بۆمانی نووسیوە .

خۆزگە لە هەموو رووداویك کە بەسەر مان دیت بیگەڕینینەوە بۆ سەرچاوەنووس و سوپاسی خوا بکەین و بەدل بلیین ﴿ أنا لله وأنا اليه راجعون ﴾ واتە : ئیمە هی خواوەندین و بۆ خواوەندیش دەگەڕیینەوە .

ئایا رۆژیك دانیشتووینە بەبی ئیش و کارکردن ؟ چاوەری بکەین خوا چی نووسیوە بیبارینی نەخیر کەس شتی وای نەکردوە .

ئەوە پشت کردنەوەیە { التواكل } ە وە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا نیە بەلکو پشت بەستن هەیە بە خودا { التوكل } کە پیغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی :

﴿ أعقلها و توكل ﴾ . بەیەکیکی ووت کە دەیویست حوشترەکەی بەرەللا بکات بەتەمای خوا ، ووتی بیبەستەوە ئینجا بەتەمای خودا.

ئەبی هەول دان بۆ دابین کردنی ئایندەی منال وەك هەولدان بۆ خواردن پەیدا کردن و ژیان بەریوە بردن بیت ئینجا بەتەمای خوا ...

ئەگێڕنەوە : کە عومەری کوڕی خەتتاب ( ڕەزای خوای لێ بێت ) دزێکی سزادا کە دەستی ببڕێتەوە . دزەکە ووتی : ئەی پێشەوا من کەدزیم کرد خوا نوسیبووی دزی بکەم و ببم بە دز ، عومەریش (ڕەزای خوای لێ بێت) وەڵامی دایەوە و ووتی : تۆ بە چارەنووس دزیت کرد ئێمەش هەر بەو چارەنووسە کە خوا نوسیویەتی دەستت دەبڕینەوە

بەڕاستی جێی سەرسووڕمانە ، تەنیا ئایندەی ڕۆڵەکانمان ئەگەڕێنینەوە سەر چارەنووس ، لەهەموو هەوڵدان و دەست کەوت وە ڕووداوی دڵ تەزێن چارەنووسمان بەبیر نایەتەوە و ناخۆشی چەند بچوکیش بێت خەمبار دەبین و نارەزایی دەردەبرین .

( ابن الرومی )ی شاعیر ئەڵێت :-

الا من يريني غايتي قبل مذهبي

ومن اين و الغاياتُ بعد المذاهب

واتە: ئایا کەس هەیە چارەنووسم پێ نیشان بدات پێش ئەوەی خۆم بیگەمێ ئەوە چۆن دەبێ ؟ چارەنووس ئەو کاتە دەبینرێ کە گەیشتین .

ڕاستە هەوڵ دەدەین بەڵام هەر ئەوە دەبێ کە خوا نووسیتی .

کاتێ گەنجێك داوای کچ ئەکات بەدڵێکی پاك بۆ خزمایەتی و کچەکەی بەدڵە و پێش هاتنی ، لێك دانەوەی خۆی کردووە و دای ناوە کە ئەو خێزانەپێی ڕازی ئەبن و کە لەگەڵ کچەکەش یەکتریان دیت و بەیەك ڕازی بوون . لەسەر ئەو دایك و باوکە پێویستە بەدڵ پاکیەوە وەڵامی بدەنەوە و بەسەربەرزی و خۆشی وەریبگرنەوە و تەگەرە نەخەنە پێش نارەزووەکەی ئەگەر بە ئاین و ڕەووشتی ڕازی بوون و کچەکەش کوڕەکەی بەدڵەو پێی خۆشە . ئەو هاوسەرێتیە لەو دووکەسە تێك مەدەن .

بەڵکو ئاسانی بکەن و گیروگرفت دروست مەکەن و مەبن بە کۆسپ مەگەر هەر بە داواکردن لەخوا لابچن ! بەڵکو ببن بە پشت و ئیشەکە تەواو بکەن . ئەی دایك و باوکان خوا ئێوەی کردووە بە خاوەن کۆزو ئەو ئەمانەتە گەورەیەی پێ ڕەوا دیتن . ئێوە بەشێوەی کۆیلە تەماشایان مەکەن مەبنە هۆی تێك دانی ژیانیان و ئاینیان .ئەو هاوسەرێتی و خێزان دروست کردنە بۆ ئێوە نییە ! بەڵکو بۆ ئەوانە و هەر خۆشیان

خۆراگر نەبن بەرامبەر ئایندەیان . ئەو خۆشەویستیەی بەرامبەر منداڵتان مەگۆڕنەوە بە خۆپەرستی . کاتی گەنجی‌یەتی خۆتان بەبیر بیتەوە چۆن بەهاوسەر بونتان پی خۆش بوو . دەبی بۆ رۆڵەکانتانیش وابن .

دڵیان مەشکێنن . ئایا هەر ئەو منداڵە نەبوو هەموو شتیکتان بۆی دەکرد هەتا گەورە بوو ؟ دڵی بەهەر شتیکەوە بوایە بۆتان دەکرد . ئیستاش وابن . بی گومان ئاینی ئیسلامی پیرۆز ریگایەکی ناوەراستە لە نیوان لادانی چەوت بەهەر لایەکی دا .

پیویستە بۆ ژیانی سەر زەوی و بۆ رۆژی دوایی ریگایەکی راست هەڵبژیرین هەر ئەو ریگایەش سوود بەخشە .

ئیسلام دەیەویت خیزان دروست کردن لەسەر ریگای دەستووری خودابیت .نەوەك رۆژئاوا کە کەس بە کەس نیە ، هەر منال گەورە بوو لە خیزانەکەی جیادەبیتەوە و پەیوەندی لەگەل نامینی .

نەوەك کۆمەڵگەی نەزانی ئیمە کە بە خۆشەویستیەکی خۆپەرستی منال سەرلی شیواو دەکەین و لی‌ی تیك دەدەین و دەمانەوی تەنیا بە دەستووری خۆمان ئایندەی منداڵیان دابین بکەین . وەکو کۆیلە لەگەل منداڵیان هەلس و کەوت ئەکەین، بەتایبەتی کچ کە هیچ مافیکی نیە لەبیر کردنەوە و بریار دانی بۆ بە هاوسەربوون . دەبی بیرکردنەوەی خیزانی موسلمان لە دانانی ژیان و بە هاوسەربوون لەسەر ری‌ی ئایینی رووناکی ئیسلام بیت . بەراستی مانەوەی گەنج ئەبیتە ئاژاوە ( فتنە) یەکی گەورە لەناو کۆمەل و ئەو ئاژاوەیەش هیچ دایك و باوکیك پیی خۆش نیە و ئەنجامی ئەو ئاژاوەیەشی بەدل نیە بەلام دایك و باوکی نەزان ئەم لیك دانەوەیەیان نیە ، لە ئەنجامدا ئەمە بووە هۆکاریکی‌بنەرەتی بۆ ئەوەی پارە و پارەپەرستن باوی هەبیت بە شیوەیەك کە هەموو گەنجیك باوەری وایە و واتی گەیشتووە کە ئەگەر بیت و دەولەمەندو و ساماندار بوایە ! ئەوە هەموو خیزانیك پیی رازی دەبوون و کچیان پیشکەش دەکرد . لەبەر ئەوە هەولی پارە پەیداکردن ئەدات بە هەموو شیوەیەك چ باش چ خراپ ، حەرام یاخود حەلال ، دوایش بەبی بیرکردنەوە دەیەویت بەهۆی سامانەکەیەوە کچیکی دیاربینیت لە ئاستی پارەکەی و بی منەت و بی نرخ زانینی

ئەو هاوسەرەی چونکە دەزانێ لەبەر خۆی نا بەڵکو لەبەر پارەکەی گیرفانی وا بەڕێزو خۆشەویست بووە ! ئەوە بۆتە بنەڕەتی خێزان دروست کردن ، دەبێ لەو خێزانە کەلەسەر بنەڕەتێکی تەماح و پارە دروست بووە چۆن منداڵێك دروست بێ ؟!.

لەهەمان کاتدا هەموو ڕێگایەکی ئاژاوە (فتنە) بۆ منداڵ ئاسان ئەکرێت لەسەربەخۆیی و بەرەڵڵایی و چاولێکردنی ڕۆژئاوا لە ژیان و ڕواڵەت ، گەنج و ئافرەت تێکەڵاوکردن و بەڵام کە گەیشتنە ئایندە دروست کردنی منداڵ و بەهاوسەربوونیان ئەوا ئابلۆقە لەسەر ژیانیان دائەنێن و ئەیانەوێ ئەو کچ و کوڕانە تووشی هیچ تاوانێك نەبن ؟!.

پرسیاریان لە ئیمامی علی ( ڕەزای خوای لێبێ ) کرد لەبارەی هاوسەرێتی کێ بەکەڵك دێت لەوەڵامدا فەرمووی :

هەموو خەڵك وەك یەکن ، عەرەبیان و عەجەمیان ، قورەیشیان و هاشمیان ، ئەوکەسە بەکەڵك دێت موسڵمان بێت و ڕاست بێ و چاك بێ ، ئەو کەسە بەکەڵك نیە کە فاسق بێت بەڵام بۆ کەسێکی زاناو شارەزا لە ئاینی ئیسلام پەسەند و باش و ڕەوایە گەر هەرژنێك بخوازێت چونکە دەتوانێت بەهۆی ئەو شارەزایی و لێزانی یەی خۆی ڕێگای چاکی نیشان بدات و بیکات بە ئافرەتێکی ڕەوشت بەرز و بەشەرم و بەئابڕو بەڵام بە مەرجێك گەر لە خۆی ڕادەتیت توانای ئەم پیشەیەی هەیە بەڵام گەر لەخۆی ڕانەدیت ئەوا ڕەوانی‌یە بۆی داخوازی هەرژنێك بکات گەر هاتوو ئەم ئافرەتە دین ویست و بەئابڕو نەبوو .(زاناش) شارەزایانی ئاینی ئەگرێتەوە چونکە پێغەمبەر ( دروودی خوای لەسەربێت) ئەفەرموێ :

﴿ الناس معادن كمعادن الذهب و الفضة خيارهم في الجاهلية خيارهم في الاسلام إذا فقهوا ﴾

واتە : واتە خەڵك کانن وەکو کانی زێڕ و زیو ، باشەکەیان لە سەردەمی نەفامی‌دا باشەکەیانە لە ئیسلام ئەگەر شارەزا بێت لە ئاینەکەی . لەو فەرموودەیە دەردەکەوێ کە هیچ کەس لە هەر تیرە و هۆزێك و نەتەوەیەك بێت ئەگەر موسڵمان بێت نابێ

داخوازی کاریك بگەرینیتەوە و پیی رازی نەبیت ئەگەر موسلمان بیت و شارەزایی لە ئاینەکەی زۆر بیت و رەوشتی بەرز بیت و باش بیت و لەگەل کچەکەش بەیەك رازی بن .

ئەوەش چەند نموونەیەکە کە لەسەردەمی پیغەمبەر (د.خ) و لەسەردەمی یارانی ( رەزای خوایان لیبیت ) رووی داوە بۆ خیزان دروست کردن :

عن المغیرة بن شعبة : انه خطب إمراة ، فقال له رسول الله صلی الله علیه وسلم : انظرت الیها ؟ قال : لا ، قال : أنظر الیها ، فأنه أحری أن یؤدم بینکما .

یؤدم بینکما : اي أجدر أن یدوم الوفاق بینکما

رواه النسائي وابن ماجه والترمذي وحسنه

واتە : موغیرە کوری شوعبە داوای ژنیکی کرد ، پیغەمبەر (درودی خوای لە سەربیت ) پیی ووت : ئایا تەماشات کردووە ؟ ، ووتی: نەخیر ، پیی ووت: تەماشای بکە ، چونکە تەماشا کردن ئەوە دیاردەکات کە لە ئایندە نیوانتان باش بیت لەگەل یەك و بە تەبایی بژین .

کەواتە پیویستە کچەکەو کورەکە تەماشای یەك بکەن : هەتا دلیان بچیتە سەر یەك ، ئەو کاتەی بەدلی یەك بوون ، هیچ کەس بۆی نیە بەینیان تیك بدات .پیغەمبەر ( دروودی خوای لەسەربیت ) چووە داخوازی کچیك بۆ هاوەلیکی خۆی کە ناوی (جلیبیب ) بوو ، وادیارە دایك و باوکی کچەکە ویستیان رازی نەبن و پییان خۆش نەبوو بەلام کچەکەیان کە گویی لیبوو هاتە لایان و ووتی پیغەمبەر (د.خ) خۆی هاتووە و ئەو کورەی بە شایانی کچەکەتان دائەنی ، ئیوە چۆن رازی نابن؟! بەلی یەکسەر دایك و باوکەکەی لەقسەی خۆیان پاش گەز بوونەوە و رازی بوون.

ئەوە چی ئەگەیەنی ؟!

وادیارە کچ توانیویەتی قسەی خۆی بکات و رای خۆی دەربری لەسەر ئاین و ریگای راست . وەهەروەها ئاستی و پلە باوەری دایك و باوکی ئەوەندە هەبوو کە پەشیمان ببنەوە لە چەوتی و نەهیلن شەیتان کاریان لی بکات چونکە ئەوان لەبەر

کچەکەیان بوو ، مادام کچەکەش ڕازی بوو ئەوان ئەو مافەیان بەخۆیان نەدا ، بێ گومان کە پێغەمبەر خۆی هات پێویستی بە پرسیار نیە .

بەڵام بەداخەوە ، لەو سەردەمە باوك و دایکی واکەمە و کچیش سەربەخۆیی‌یان لە ڕێگای چەوت زیاترە لەوەی لە ڕێگای ڕاست ڕێیان پێ بدرێ زۆر لەدایك و باوکیش ئامۆژگاری وەرناگرن . ڕەنگە ئامۆژگاری کاریان تێ نەکات و نەترسێن لەپاشە ڕۆژ و لە ڕۆژی دواییش ئەوە جیاوازی پلەی باوەڕداری قوڵ و بیرکردنەوەیە لەسەر دەستووری خودا . دەبێ زمان و دڵ لەگەڵ یەك بن و کارکردن ڕەنگ دانەوەی باوەڕبێت . هەتا ئێستا لە پێشینە چاکەکان ( السلف الصالح) هیچ بەرگوێم نەکەوتووە و نەم خوێندیتەوە کە تەگەرەیان دابێتە بەر ئیشی خێر ، وە بە هاوسەربوونی ڕێك و پێك هەر ئاسان کراوە .

( سعیدی بن مسیب ) کە یەکێکە لە پێشەواکانی ( تابعین ) لە خەڵکی مەدینە کچەکەی خۆی بە دوو پەنجایی مارە کرد لە گەنجێکی هەژار لە قوتابیەکانی خۆی کەس بە چەوتی نەزانی و باسی نەکرد و لەگەڵ ئەوەش کچەکەی زاناش بوو .

(ابو درداء) (خوایی لێ ڕازی بێت) کە یاری پێغەمبەر (د.خ) بوو لە دیمەشق ، معاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان ) داوای کچەکەی کە ناوی ( درداء) بوو بۆ ( یزید)ی کوڕی . بەڵام ئەبوو دردا ڕازی نەبوو لە پاشان کچەکەی دایە گەنجێکی موسڵمان کە لە کۆمەڵەی گشتی خەڵك بوو لە دیمەشق بڵاوبووە کە ( ئەبوو درداء) کچەکەی داوەتە شوو کە پرسیاریان لە ئەبوو درداء کرد ووتی :

من بۆیە کچەکەم نەدایە ( یەزید ) چونکە ترسام کچەکەم لەناو ئەو خۆشی و خزمەتکارو گەورەیی دونیا ئاژاوە بکەوێتە ناو ئاینەکەی .

ئا بەو جۆرە کچ بە شوو ئەدرا لە یەکەم جارەوە بیریان لە ئاین و باوەڕ ئەکردەوە خۆزگە ئێستاش خێزان کەمێك بەرەو باوەڕ بگەڕێنەوە لە بیرکردنەوە بە تایبەتی بنەڕەتی ژیان دەست پێ کردن کە بەهاوسەر بوونە کە ئایندەی مرۆڤە لە ژیان و لە ئاین . ئەو کارانە بەهرە نیە : بەهرە لە قوڵی باوەڕیاندایە و ئەو باوەڕەی کە وای لێ کردوون بترسێن و بەبیری ئیسلام بیربکەنەوە و لە ورۆژە بترسێن کە خوای گەورە لە

سورەتی ( الزلزله) دەفەرموی ﴿ فمن يعمل مثقال ذرة خيرا يره (٧) ومن يعمل مثقال ذرة شرا يره (٨) ﴾

واتە: ئەوەی لە کیشی ئەتۆم ( زەرە )یك چاکە بکات دیتەوە پیشی و ئەوەی لە کیشی ئەتۆمیك خراپە بکات دیتەوە ریی . بەلی ئەو هەموو ئامۆژگاریە جیگای هیچ ناگری گەر دلی بیرو باوەری تیا نەبیت و نەترسی ولە دوارۆژ و بیروباوەرەکەی هاندەری نەبیت بۆ کاری چاکە .

( بلال حەبەشی ) (رەزای خوای لیبی )کە بەندەیەکی حەبەشی بوو خوای گەورە بە ئاینی ئیسلامی پیرۆز بەرزی کردەوە ، خوشکی (عبد الرحمنی کوری عوف)ی هینا کە ( عبدالرحمنی کوری عوف ) لەیەکە دەولەمەندەکانی ئەوکاتەی قوریشی بوو .

کەواتە لەکاتی پیشینە چاکەکان تەنیا پیوانەی باوەر و رەوشتی چاك هەبوو بۆ بە هاوسەر بوونی دووکەس.

پیغەمبەر (د.خ) زەینەبی کچی جەحش ( رەزای خوای لیبی ) کە کچی پووری بوو دایە زەیدی کوری حارسە . کە زەید لە پیش ئیسلام بە بەندەیی درایە ( خدیجەی گەورە ) رەزای خوای لیبی ئینجا ئەویش پیشکەشی پیغەمبەری کرد پیغەمبەریش ( د.خ) ئازادی کرد و کردیە کوری خۆی و زۆریش خۆشی دەویست . زەینەب و براکەی کە ناوی ( عبدالله بن جحش ) بوو رازی نەبوون بەلام ئایەتی (٣٦) لە سورەتی ئەحزاب فەرمان بوو لە خواوە کە هەرئیشیك خواو پیغەمبەری خوا بیکەن لەسەر موسلمانان کەس ناتوانی بەو ئیشە رازی نەبیت : کە خوای گەورە دەفەرموی :

﴿ وما كان لمؤمن ولا مؤمنة إذا قضى الله ورسوله أمرا أن يكون لهم الخيرة من أمرهم ومن يعص الله ورسوله فقد ضل ضلالا مبينا (٣٦) ﴾

بەوجۆرە ( زەینەب ) رازی بوو .

بی گومان هەزارەها نموونەی وا هەیە هەمووی یەك شت پیشان دەدا . ئەویش قولی بیروباوەر بەخوا کە کاری کردبووە سەر هەموو جولانەوەیان و هەر هەلس و کەوتیکیان بکردبایە ئەوا بە پیوەری باوەر بوو بۆ خۆ ئامادە کردن بوو بۆ رۆژی

دوایی ، ڕۆژی سزاو پاداشت ، پێغەمبەر (د.خ) جیاوازی لە نێوان خەڵکی دا نەهێشت تەنیا جیاوازی بیرو باوەڕ نەبێت . تەنها عەرەب و عەجەم و قورەیش هیچ جیاوازیان نەبوو بەڵکو فەقیرو دەوڵەمەند و دەسەلاّت دارو بێ دەسەلاّتیش جیاوازی‌یان نەبوو .

لە دواییدا ئەو دوو نموونەیەی خوارەوەم نووسی کە هەزارەها بەسەرهاتی ناخۆشی ترو گەورەترو دڵ تەزێن تر و بەتاوان تر هەیە و ڕودەدات لەو سەردەمەدا کە هەندێکیان هەر باسی ناکرێت کە ڕەنگە لەو سەردەمە خەڵك خۆی بە نوێخوازتر و پێشکەوتوتر دابنێ لە چاو سەردەمی چەرخی زێڕینی ئیسلام چەرخی پێغەمبەر و هاوەڵەکانی (ڕەزای خوایان لێبێ ) بەلاّم بەداخەوە ئەوپێشکەوتنەی ئێستا تەنیا لە ماددە بوو هەروەها لە زاڵبوونی ڕواڵەتی ماددی بەسەر فترەی پاکی مرۆڤ و وای لێکرد مرۆڤایەتی و بەزەیی و پێکەوە ژیان پاش بکەوێت . بەو جۆرە مرۆڤ بێ شکۆمەندی بژیت هەست بە مرۆڤایەتی خۆی نەکات تەنیا وەك بەندەی مرۆڤێکی تر خۆی لە ماددە تێر بکات و هەوڵی بۆ خۆی بێت و بەس ئەوە سەردەمی بەندەی ئادەمیزادە بۆ ئادەمیزادی تر کە وای کرد هەست و بیرو کردنەوەی هەرکەس لە بۆ خۆی بێت .

داوام وایە کە ئەو دوو نموونە کورتە ئەخوێننەوە کارتان بەشێوەیەك لێ بکات کە ڕنگە ئەوانە خوشك و براو منداڵی ئێوە بن بترسێن لەو ئەنجامی بەرەڵلاّیی و بێ باوەڕیە :

١- ژنێك مێردەکەی مرد وە ئەم ئافرەتە گەنج بوو بەتەمەن دانەچوو بوو و منداڵیشی هەبوو ، لە پاش تەواو بوونی (عدە) ی وویستی شوو بکاتەوە بەلاّم ،لەو سەردەمە بە تاوانی دەزانن کەوا ژن شوو بکاتەوە گەر منالی هەبێت بە تایبەتی گەر کوڕ بێت ئەو ژنە داخوازی هات بەلاّم کێ ڕازی دەبێ ؟! خێزانی مێردەکەی لەوانەبوو بیکوژن ، باوك و دایکیشی پشتی ناگرن ، بەو جۆرە دەرگای سۆز و دینداریان لێ گرت و ڕێی بێ دینیش زۆرە ! .... خۆی و پاوەکە یەکیان بەدڵ بوو هاتوو چۆو تەنیایی و دەروپشتی خراپ کە ئاگایان لەوە نیە چاکە بکەن و یارمەتی بدەن بەلاّم بۆ خراپە و غەیبەت و بوختان هەر خۆیان ئاگادارن هەتا تووشی گەورەترین تاوان بوون

و بەو شیوەیە دونیاو قیامەتیان لەدەست چوو مەگەر خوا رەحم كات . ئینجا پیاوەكە و ژنەكەیان كوشت .

كی تاوانبارە ؟ ئایا هەر ئەو دووكەسە؟ نەخیر ! كۆمەلی دەوروپشتیان تاوانبارن چونكە ری‌ی حەلالیان لی گرتن و بوون بە شەیتان و نەیان هیشت لەسەر ریبازی ئیسلامی پیرۆز كە مافی هەموو كەسیكی پاراستووە بین بە هاوسەری یەك و گیروو گرفتی كۆمەلگا كەم بیتەوە سەرەنجام ری‌ی چەوتیان گرت و ئەمەش ئەنجامەكەی .

دەبی بزانین كە پیغەمبەر ( د.خ ) دەفەرموی ﴿ الحیاء شعبة من الایمان ﴾ واتە : شەرم و حەیا بەشیكە لە باوەر مانای ئەوە نیە كە شەرم و حەیا لە مرۆڤوات لی بكات شەرم و حەیا لە خوای پەروەردگار نەكەیت بەلكو ئەو شەرمو حەیایە لە خوا بكەیت و لەسەر ریگای خوا كە ( لاحیاء في الدین ) شەرم نیە لە ئایندا دەبی هەول بدەین لەسەر ریگای خوا بۆ ماف سەندن نەك لە شەرمی بەندە خۆمان تووشی تاوانی گەورە بكەین ئەبی شەرمو حەیا بكەین لە خوای گەورە و لە فریشتەكانی سەر شانمان .

٢- گەنجیك لەگەل گەنجیكی تر هاوریی‌ی یەكتری بوون و هاتووچۆی مالی یەكتریان دەكرد گەنجەكە خوشكی هاوریكەی بەدل بوو داوای كرد بەلام نەیاندایی كە چی گەنجەكە دلی كەوتبووە سەر ئەو كچە چەند لە پیاوانی ئاینی و دونیایی گەورەی نارد بۆ خوازبینی كەچی مالەكە دلیان رەق تربوو . وای لی‌هات گەنجەكە بە نهینی كچەكە مارە بكات بەنیازی ئەوەی مالی خاوەن كچەكە بكەونە بەرامبەر ئەوكارە و رازی‌بن ، كەچی بە پیچەوانەوە ئیشەكە زیاتر ئالۆز بوو چەند جار ویستیان كچەكە بكوژن . بەكورەكەیان ووت ئەگەر تەلاقی نەدەی ئیمەكچەكە دەكوژین ، ناچار كورەكە تەلاقی دا . ئەو كورە بەسەرهاتەكەی خۆی هەر بە گریان دەگیرایەوە هەموو كەسیك هیوای دەخواست كە یارمەتی بدات بەلام لەگەل دایك و باوكی نەزان و خوانەناس هیچ ناكری .

ئەوە و هەزارەها بەسەرهاتی تر كە زۆرداری لە كچ و كور دەكری ووای لی دیت تووشی تاوانیان بكەن و ری‌ی چەوت بگرن بی شەرم بن لەگەل دەورو پشتیان و ئەو

بێ شەرمیەش ببێتە هۆی ئەوەی بێ باوەڕبن . با هەر لەیەکەم جار ئەو هەڵوێستانە بە شێوەیەکی ئاینی و باوەڕەوە شیکار بکرێت ئەوا گیروگرفتەکان بە شێوەیەکی زانستیانە چارەسەر دەکرێن و ئەو هەموو شتە ڕوونادات و کەسیش تووشی تاوان نابێت ، بالەیەکەم جار ئاگاداری کچیان بن و ئەوەندە سەربەخۆ نەبێ ولە دوایشدا لەناوی نەبەن بە تێکەڵ کردنی هەندێك لە باوەڕ و ئاین و بەزەیی و خۆشەویستی و دوورکەوتنەوە لە خۆپەرستی و پارەپەرستی .

لەو بەسەرهاتانەدا دەردەکەوێ کە : ئەگەر بێتوو لەیەکەم جارەوە لەسەر ئاینی ڕوونـاکی ئیسـلام بڕۆیـن ئـاوا ناکەوینـە نـاو ئـەو گیروگرفتانـە و نـەبێ پیـلان و نەخشەکێشانمان لەسەر ڕێی خوا دابڕێژین و باوەڕداران لەگەڵ یەك بەبەزەیی و سۆز بجولێنەوە لە هەمان کات بزانن باوەڕدار ئەبێ لەگەڵ برای باوەڕداری چۆن بجولێنەوە و لەسەر ئەوەش پێغەمبەر ( د.خ ) دەفەرموێ : ﴿المؤمن أخو المؤمن ولا يحل له أن يبتاع على بيع أخيه ولا يخطب على خطبة أخيه حتى يذر﴾ رواه أحمد ومسلم .

يذر : يترك

واتە : باوەڕدار برای باوەڕدارە حەڵاڵ نیە لەسەر فرۆشتنی برای مامەڵە بکات و لەسەر داخوازی برای داخوازی بکات .

کەواتە هەر کچێك داخوازی کرابێت کچەکە پێی ڕازی بووبێ برا موسڵمانێکی تر بۆی نیە داخوازی ئەو کچە بکات . پێویستمانە بگەڕێینەوە سەر قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر ( د.خ ) هەتا ژیانمان تێك نەچێت و هەردوولا لەدەست نەدەین هەم دنیا و هەم ڕۆژی دواییش . قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) بکەینە ئامۆژگاری بۆ هەموو گیرو گرفتێك .

چونکە وادەردەکەوێ بە هاوسەربوونی حەڵاڵ ڕێژەیەکی پێچەوانەیە لەگەڵ زیناکردن و ڕێی حەرام وەك بیرکاری هەرچەندە بە هاوسەربوون گران بکرێت و ڕێی پێ نەدرێ ئەوا زیناکردن ئاسان تردەبێ چونکە ئەو هەموو گەنجە بێ گومان شتێکی زۆر سروشتیە کە حەزیان بچێتە ژنهێنان بەڵام ئەگەر بە حەڵاڵی نەتوانن ئارەزوە ڕەگەزیەکان تێربکەن ئەوا خۆ ڕاگرتنیان زەحمەتتر دەبێ بەرامبەر لاکەی تر لەبەر ئەوە

( فـرض عـين )ە ( پیویستە ) لەسەرمان کـە یارمـەتی هـەموو گـەنجیك بدەیـن و ڕێی بەهاوسـەربوونی بـۆ ئاسـان بکـەین و ئامۆژگـاری ئـەو براگەنجانـە بکـەین کـە ئەگـەر دەتوانن خیزان بەخیو بکەن ئەبی ژن بینن . خەلیفەی موسلمانان ( عمری کوری خطـاب) (ڕەزای خوای لێبی ) وتوویەتی هەر گەنجیك کە توانای ژن هینانی هەیە و ژن نەهینی ئەوە لەبەر (فسق و فجور )ی تی .

ئەبی کچ و هەروەها خیزانەکەی ئەوەندە ئیشی بەهاوسەر بوون زەحمـەت نەکەن و یارمەتی دەرین بۆ گەنج لە بەهاوسەر بوون بە حەلالی . بەلام بەداخەوە هەندی دایك و باوك هیچ بیر لە کچ و کوریـان ناکەنـەوە و دەشـزانن حـەزیان لـە بەهاوسـەربوونە ، هەست بە هیچ بەرپرسیاریك ناکـەن پەلـە ناکـەن کـە منالـەکانیان لەخـەم دەرکـەن و تووشی هەلە نەبن .

ئـەبینین لـە وولاتـی ڕۆژئـاوا هـەتا گـەنجیك ژن دینـی و بەرپرسـیاری خـیزانیك دەگریتە ئەستۆی . ئەو کچ و کورە چەندەها جار (أعـوذ بـالله) تووشـی زینـا بوونـە و پییان شتیکی زۆر ئاسانیشە بەلام مەسئولیەتی ژن هینـان و شووکردنیان بە حـەلالی زۆر لا زەحمـەت ترە کەچی بە حەرامیش منداليان دەبی پییان ئاسانترە .

سبحان الله چەند کاری خوایی زەحمـەت و گران بیت بەرامبـەری کـاری شـەیتان سووك و ئاسـان دەبیـت . هەرچـەندە ڕێی خـوا لـە بیرو هۆشمـان کـەمتر جـی گـیر بـی مانای وایە ڕێی شەیتان چاکتر چەسپاوە . خوای گەورە لە خراپە بەدوورمان خاتەوە

# بەشی دووەم
# فرە ژنی

بێ گومان فرە ژنی یەکێکە لە مافە ڕەواکانی ژن ، پێش ئەوەی مافێك بێت بۆ پیاو ، چونکە بە فرەژنی ژنی بێ پیاو نامێنێ و وە فرە ژنیش نەبێ لەسەر دەستووری خودایێ ، مەرجە شەرعیەکانی جێبەجێ بکرێ لە دادگەری نێوان ژن و بەخێو کردنیان و بە جیادانانیان . هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی :

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا (٣) ﴾

سورة النساء

واتە : ئەگەر ترسان لەوەی نەتوانن مافی ئەو کچە هەتیوە بپارێزن کە لاتانە کاتێ کە حەزدەکەن مارەی بکەن ئەوە ژنی تر بێنن چەندتان حەز کرد دوو یان سێ یان چوار ( لەوە زیاتر حەرامە) ئەگەر ترسان لەوەی نەتوانن بە دادگەری ڕایان بگرن ئەوا یەك ژن بێنن یان ئەو ژنانەی لە ژێر دەستانن وەك کەنیزە ئەوە باشترە کە دادگەر بن و زۆرداری نەکەن .

خوای گەورە و میهرەبان لە ئایەتێکی تر باسی دادگەری کردووە وەك وەڵام دانەوەیەك دەفەرموێ :

﴿ وَلَن تَسْتَطِيعُوا أَن تَعْدِلُوا بَيْنَ النِّسَاءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلَا تَمِيلُوا كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ وَإِن تُصْلِحُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا (١٢٩)﴾ سورة النساء

واتە: ئێوەئەی پیاوان ناتوانن ژنەکانتان بە دادگەری ڕابگرن ئەگەر هەوڵیشتان دا لەبەر ئەوە لارمەبنەوە بۆ لایەکیان و ژنەکەی تر بە ڕاگیراوی بهێڵنەوە لە نێوان ئەوەی

نەبیوەژن بیت و نە میردی هەبیت . ئەگەر چاکە بکەن و خۆپاریزین خوای گەورە لێ بوردەو بە بەزەییە .

چونکە کاتی ئافرەت یان پیاو بە تەنیا ئەمینیتەوە گیروگرفتی کەسایەتی زیاد دەکات و هەر لەبەر ئەوەشە حیکمەتی حەلال کردنی فرە ژنی . چونکە هەموو کاتیك ئافرەت زۆرترە لەپیاو و ئافرەتیش کۆمپانیای دروست بوونی ئادەمیزادە و ژمارەشیان زیاترە لە پیاو هەتا لە گیانلەبەرانی تریشدا .

هەندی بارودۆخ هەیە دیتە پیش پیاوان ریژەیان کەم دەبیتەوە و ریژەی ژنیش هەر لەزیادییە بۆ نموونە پیاو زۆرینەی ئیشە گرانەکانی ژیانی کەوتۆتە ئەستۆ وە سەر ئەو گۆی زەمینە بە پیاو بینا کراوە و بەپاو پاریزراوە ، لەبەر ئەوە بەرەنگاری خەستی و تەنگ و چەلەمەی ژیان دەبی وزۆر جاریش ژیانی لەدەست دەدا . جگە لەوەش پاراستنی وولات و مال و مندال پیاو تووشی مردن دەکات و هەر لە ریژەی کەم دەبیتەوە ، سبحان الله نەخۆشیش زیاتر پیاو لەناو دەبات لەژن ، جگە لەوەش کە ئافرەتیش منالی لەبار دەچیت زیاتری نیرە لەبەر ئەم هۆیانە پیاو کەمتر دەبیت و ژنی بی پیاو زیاتر دەبی . ئەگەر بیتوو بەووردی سەیری فرەژنی بکەین و بەبیریکی پر لە باوەرەوە دەبینین چەند حیکمەتیکی تیایە لەوانە بە کورتی لە هەندیکی دەدویین ئەو حیکمەتانەی بەبیرەتەسکەکەی خۆمان بیری لێ ئەکەینەوە ، بەلام ناتوانین سنووری چاکەی فرەژنی بزانین کە بۆ خوا حەلالی کردوە ؟ لەوانە :

١- بەهاوسەر بوونی هەموو ژن و پیاویك .

هەروەکو لەمەوپیش باس کرا ریژەی ژن زیاتر بوو لە پیاو ، فەرمانیشە کە هەر هەمووی بە هاوسەر بکرین ، ریگا چارەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە ری بەوە بدری کە پیاو زیاتر لەیەك ژن بینی ، ئەو مافە دراوەتە ئافرەت کە مافیکی رەوای حەلالە کە خوای گەورە و میهرەبان وەك دیارییەك بۆ ژن داینـاوە کە دەبی بی پیاو نەمینیتەوە و نیوەی ئاینی تەواو بکات و خۆشی ژیانیشی دەست کەوی و هاوسەریکی هەبی بە حەلالی ژیانی لەگەل بەسەر بیات .

٢-هەموو ئافرەتان و پیاوان دەرفەتیان دەست دەکەویّ کە ببن بە باوك و دایك بەوەی ئەگەر خۆشی مندالّی نەبوو ئەوە ئەگەر ژن بیّ منالّی میّردەکەی لە شەرعدا وەك منالّی خۆیەتی ، ئەگەر پیاویش بوو بیّوەژنیّکی بە منالّ بیّنیّ ئەویش وەك منالّی خۆی دەبیّ .

بەلاّم کە فرمژنی بەکاریّکی ناڕەوا لەقەلّەم دەدریّ ( پەنا بەخوا ) بیّ شەرمانە ستەم لە قورئانی پیرۆز سونەتی پیّغەمبەر دەکریّ ئەوەش لە سەرەتاوە لە دوو سەرچاوە هاتووە :

١- لە دەرەوە :

لەلایەن نەزان و گومڕاکان و بەهۆی ( ئیستشراق ، تبشیر ، استعمار ) کە پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن . کە هەموو کات دەیانەویّ ئەو ئاینە پاکەمان لیّ بشیّویّنن و بەشیّوەیەك کە هەستیشی پیّ نەکەین و شیرازەی کۆمەلاّیەتی جوان و ڕەوشتی بەرزی کوردەواریمان لیّ تیّك بدەن . هەولّیان داوە بە پشتیوانی شەیتان کردەوەی خراپمان بۆ بە جوان نیشان بدەن ، لە جیاتی ئەوەی ئافرەت بە ئابڕووی خۆیەوە شوو بکات ، ئافرەتیان لە ڕیّ دەرکرد و وایان لە ئافرەتان و پیاوان گەیاند بە هۆی بەڕەلاّیی پیّش دەکەون و پیّویست نیە ئافرەت هاوسەری هەبیّت .

٢- لە ناوەوە : سروشتی ئافرەت وایە حەزدەکا لەگەلّ هاوسەرەکەی بە تەنیا بژی و هاوتایەکی نەبیّ ئەمەش بووەتە هۆی یارمەتی ئەو تەزوە گومڕایانە ، بیّ ئەوەی هەست بکەن کەوا بوونەتە چەکی دەستی بیّ بڕوایان .....

بۆ نموونە گومان لەوەدا نیە مندالّیش حەزدەکات بە تاقانەیی بمیّنیّتەوە هەتا خۆشەویستی دایك و باوك بۆ ئەو بیّ بەتەنیا ..... بەلاّم هیچ دایك و باوکیّك پرس بە مندالّی یەکەم ناکەن ئەگەر بیانەویّ منالّیّکی تریان ببیّ . وە لە هەمان کاتدا ئافرەت حەز دەکات ژنی بەسەر نیّت ، بەلاّم شەرع دایناوە هەر پیاویّك بیەویّ ژنیّکی تربیّنیّ دەبیّ پرس بە ژنەکەی بکات ...... نەخیّر چونکە ژن ناچار نەبیّ ڕازی نابیّت ژنی بەسەر بیّت و هاوتا بۆ خۆی پەیدا بکات . چونکە ئەم ژنە دەیەویّ سامان و پارەی

پیاو هەربۆ خۆی بێت و تنانەت حەز ناکات پیاوەکەی یارمەتی دایك و باوکیشی بدات لای وایە ئەوە مافی خۆیەتی !!

## مەرجەکانی فرەژن

١- دەبێ پیاو بتوانێ بەخێویان بکات . بەلام شێوەی بەخێوکردن چەند جۆرێکی هەیە : لە پێشینە چاکەکانمان دیارە کە زۆربەیان هەژاربوون زۆر جار دەنکە خورمایەك نەبوو بیخۆن ئینجا ژنیشیان زۆر دینا کەواتە ئەگەر بیەوێ بەخێویان بکات مانای ئەوە نیە هەریەکەیان هەموو پیداویستی ژیانی (پلە یەکی ) ئەمرۆی هەبێ ، هەموو کات پر لەمالی خواردن بێ ، خوای گەورە رزق دەرە و هەر رۆحێك کە دروستی کردووە رزقی بۆ دابەش کردووە ئەگەر شووی کردبێ یان نا .

٢- دەبێ بەجیا دایان بنێ . واتە هەریەکەیان لە مالی خۆی سەربەخۆ بێ وە حەرامە پیاو پێکەوەیان دانێ ، تەنیا مەرجێك نەبێ ئەویش ئەگەر ئافرەتەکان بەبێ ترس و بەبێ شەرم رازی بوون لەگەل یەکتر بژین ئەوە ئەو کاتە لەگەل یەکیش بن ئاساییە . چونکە ژیان لەگەل یەکتر گیروگرفت زیاد دەکات . پێغەمبەر ( د.خ ) نۆ ژنی پێکەوە هەبوو هەریەکەیان لە ژووری خۆیان و خواردن و خواردنەوەشیان جیابوو . ئەگەر چی خواردنیشیان نەبوو . دەگێرنەوە هەندی جار بە مانگ ئاگر لە مالەکانی پێغەمبەر ( د.خ ) نەدەکرایەوە ، کەواتە بەجیادانان مانای ئەوە نادات هیچ کەموو کوریان نەبێ بەلکو بۆ ئەوەیە گیروگرفتی ناو خێزان کەم بکرێتەوە .

٣- **پیاو هەول بدات جیاوازی لە نێوان ژنەکاندا نەکات** . ئەوەی لەدلیەتی لە جیاوازی خۆشەویستی ئاشکرای نەکات و دادپەروەر بێ لە گەلیان . پێغەمبەر ( د.خ) دەفەرموێ ﴿ من كان له إمرأتان فمال إلى إحداهما جاء يوم القيامة وشقه مائل ﴾ رواه أبوداود والترمذي والنسائي .

واتە : هەرپیاوێك دوو ژنی هەبوو یەکێکیانی ویست و ئەوی تریانی نەویست ئەوە رۆژی قیامەت لایەکی لەشی لایەکەی تر رادەکیشی واتە لایەکیان لەسەر زەوی دەخشی چونکە پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ ژن ئەسیرە لەژێر دەستی میردەکەی . زۆر

ژنهێنان بەڕاستی موعجزەی ژن پاراستنە چونکە لە ئیسلامدا . پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ ﴿ لا رهبانية في الإسلام، وَمَن رَغِبَ عَن سُنتي فليس مني ﴾ واتە دەبێ چ ژن چ پیاو بەبێ هاوسەر نەمێنێتەوە بێ هاوسەری لە سوونەتی پێغەمبەردا نی یە (د.خ) بەهیچ جۆرێك . بەڕاستی مانەوەی ئافرە بێ هاوسەر جێی بەزەیی یە چونکە بێ بەشە لە خۆشی ژیان و ماڵ و منداڵ ویان ئەوەتا ئافرەتە بێ باوەڕەکان دەست بە ڕابواردن دەکەن چونکە ترسێکیان لەسەر نی یە و بیر لە دواڕۆژ ناکەنەوە و شەرمیان نەماوە ، بۆ نموونە لە شوێنێکی وەك بەڕازیل دوو ملیۆن ئافرەت بگرە زیاتریش بە خۆفرۆشتن پارەپەیدا دەکەن . وە زۆربەی وولاتانی ئەورووپا و ئەمریکا ژنەکانیان بێ کەڵکو تاوانبارن ..... ! ئایا ئەو ئاین و حوکمەتانەی کە فرە ژنی قەدەغە دەکات چۆن ئەو کارانەی کردۆتە سوونەت ؟؟؟

ئەگەر ئیسلام ڕێی بە فرەژنی داوە .........! ڕێگای ئەوان زۆر ژنەو زۆر مێردەیە بەڵام بێ ئەرك و بەرپرسیاری کۆمەڵایەتی هەر وەکو ژیانی ئاژەڵ .

ئەو پیاوانەی کەپڕوپاگەندە دەکەن دژی فرەژنی دەبوایە بەهیچ جۆرێك تەماشای ژنی تر نەکەن !! ..... دەست لەناو دەستیان نەنێن و شتی تر .... ئەوەندە ڕێزی ژنیان گرتبێ کە باسی دەکەن . بەڵام دەبینین بە پێچەوانەوە زۆربەیان نەك لەگەڵ چوار ژن بەڵکو لەگەڵ زیاتریش ڕادەبوێرن . ئەوانە لە ڕوناکی یەك ژنی بەدەسەڵاتی بێ ترسیان هەیە و لەتاریکی چەندەها ژنیان هەڵخەڵەتاندووە بۆ ڕابواردنی خۆیان . بێ ئەوەی ئەو ژنە بێ دەسەڵاتانە بتوانن بەحەڵاڵی شویان پێ بکەن و لەڕوناکی پەیوەندیان هەبێ . بەڵکو ئەو ئافرەتانە سەرشۆڕی دنیا و قیامەتن . کاتێ ئەو ئافرەتە سەر لێ شێواوە باسی شووکردن دەکات هەزارەها فەلسەفەو پەند و ڕەووشتی ڕێك باس دەکات بۆ سوارچاکەکەی . کەبەو مەرجانە ڕازیە . بەڵام تەماشا دەکەن سەرلێ شێواوە و هەر ڕۆژێ پیاوێك تاقی دەکاتەوە ..... خوای گەورە بمان پارێزێ، ئەو ئافرەتانە هەرچەندە خۆیان بە تێگەیشتوو دەزانن ن بەڵام لەڕاستیدا هەڵخەڵەتاوی چەند پیاوێکی گومران کەوەك گورگ گۆشتەکەیان دەخۆن و ئێسکەکەیان فڕێ دەدەن .

ئەو ئالایەی کە ئافرەتـان بـەرزی دەکەنـەوە دژی فرەنـی چـەندەها ئـافرەتی بـی پیـاویش چونەتە ژێـری!... بـەبێ ئـەوەی بزانـی ئـەو هەلخەلـەتاوە و پشـتی ژنـە بـە میردەکانی گرتووە ، لە وانەشە ئەو ئافرەتە بێپیاوە پەیوەندی ناشەرعی هەبێ لەگەل پیاوی بەژن بە نهێنی و بەئاشکراش نەفرەت لە فرەژنی دەکات (پەنا بەخوای گەورە)

زۆر لە ئافرەتان بە هیوای ئەوە دەژی شوو بە پیاویك بکەن کە ژنـی هـەبێت بـەلام لەترسـی دەرووپشت و دایك و بـاوك واز لـەو بیرە دینـی و ئـەو هیوایـەی وەك گرێیـەك لـەدلی دەبێتـە ئـالۆزی و نەخۆشـی دەروونـی ، رق و کینـە لـەم کۆمەلـە بـی بەزەییـە هەلدەگرن . کە خـوای گـەورە حـەلالی کـردووە ، دووەم ژن و و سـی یـەم ژن و چوارەم ژن وەك یەکەم هیچ جیاوازی نی‌یە .

فرەژنی سوودی تایبەتی هەیە بۆ پیاو :

ئەم سوودانەش بۆ ژن دەگەرێتەوە بەلام لە روالەتدا پی‌ی ناخۆشە وەك :

١- ئەگەر پیاو مندالی نەبوو ژنیکی خاوەن مندال بینـی وەك منـالی ئـەو پیـاوەی لی دیت پیویستی نیە تووشـی ئـەو تاوانـە بیـت کـە هـەندی خیـزان تـی‌ی دەکـەون بـەوەی منـالیکی تـر دەکەنـە منـالی خۆیـان ئـەوەش زۆر تـاوانیکی گـەورەیـە و نـەفرەتی خـوای لەگەلە . خـوای گـەورە لـە قورئـانی پـیرۆز دەفـەرموی : ﴿ ادعوهم لآبائهم هو أقسط عند الله فإن لم تعلموا آباءهم فإخوانكم في الدين ومواليكم وليس عليكم جناح فيما أخطأتم به ولكن ما تعمدت قلوبكم وكان الله غفورا رحيما (٥) ﴾ سورة الأحزاب اية

واتە : ئەو کورانـە بەناوی خۆیانـەوە ناویـان بـەرن و بانگیان بکـەن ئەوەندە پەسـەندە لای خـوا ، ئەگـەر باوکیانتـان نەدەناسـی خۆبرای‌دینیتـان ، سـەر بـە ئیـوەن لـە ئیـوەن ( ئەگەر دوور لە سووکایەتی ) هەلەیەکتان کرد ئەوا قەی ناکات بەلام ئەگـەر لـەدلتاندا نیـەتیکی ناپــاك هــەبیت هەمیشــە و بــەردەوامیش خوالیخۆشـبوو ومیــهرەبان ( لە هەلەکانتان دەبووریت ئەگەر لی‌ی پەشیمان ببنەوە .

٢- لەتاقی کردنەوەی ناو کۆمەلگا دەبینین ئەگەر پیاویك زۆر ژنی هـەبیت یـەکیکیان بە هەر هۆیەك گیان لەدەست بدات ئـەوە مـال لە مندالـەکان تیك ناچی و ژنـەکانی تـر

بەخێویان دەکەن و بەزەییان پێیان دێتەوە بە پێچەوانەی ئەو پیاوەی یەك ژنی هەیە و گەر ئەو ژنەش بەهۆی نەخۆشیەکەوە لەناو چوو یان بەهۆی گیروگرفتێك لێك جیابوونەوە کاتێك ئەو پیاوە ژنێکی تر دێنێ هیچ پەیوەندی لەگەڵ ئەو منداڵانە نەبوە و نەیانی دیوە و بەزەیی پێیان دا نایەتەوە زۆر لە گەڵیان خەراپ دەبێ ، بەڵام کە دوو ژن یان زیاتر لەگەڵ یەکتر دەژین ڕاستە هەموو کات لە مونافەسەدا دەبن بەڵام هەندێك سۆزو بەزەیی لەنێوانیاندا پەیدا دەبێت بەو ڕاددەیەی لەپاش مردنی یەکیان ئەوی تر بەزەیی بە منالەکاندا دێتەوە .

٣- بەهۆی فرەژنی ئەرکیپیاو لەسەر ژن کەم دەبێتەوە : لەبەر ئەوە کە ژنێك نیو پیاوی دەست دەکەوێ یان سێ‌یەکی وە یان چواریەکی چونکە ژیانی ئەو پیاوە دابەش دەبێ بەسەر ژنەکاندا بەوە ئەرکەکەشی ( ئەجری ) کەم دەبێتەوە و چونکە پێغەمبەر ( د.خ ) دەفەرموێ : قالت عائشة (رضي الله عنها ) سالت رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) أي الناس أعظم حقاً على المرأة؟ قال: زوجها قالت: فأي الناس أعظم حقاً على الرجل؟ قال أمهُ ) رواه الحاكم .

واتە : عائشە ڕەزای خوای لێبێ خێزانی پێغەمبەر ( د.خ ) لەپێغەمبەری (د.خ) پرسی کێ گەورەترین ماف لەسەر ژنە ؟ ووتی مێردەکەی: عائیشە ڕەزای خوای لێبێ ووتی ئەی کێ گەورەترین ماف لەسەر پیاوە ؟ ووتی دایکی . پێغەمبەر ( د.خ ) دەفەرموێ ﴿ أيما إمراة ماتت وزوجها عنها راضٍ دخلت الجنة ﴾ . واتە: هەرئافرەتێك بمرێت و پیاوەکەی لێی ڕازی بێت ئەوە جێگای بەهەشتە و دەچێتە بەهەشت ) . ئەو کاتەی کە پیاو زۆر ژنی هەبێت هەریەکەیان دەیانەوێ بە جوانترین شێوە ئەرکی سەر شانی جێ بەجێ بکات و مێردەکەی ڕازی بکات .

٤- ئافرەت هەموو کات حەزی لەپێش برکێ هەیە لەگەڵ یەکتر لەسەر جوانی و پاکی و ماڵی دونیاو خانووی خۆش و زۆر شتی تریش ، ئەگەر بێتو پیاو زۆرژنی هەبێ ئەوا ژنەکان هەموو ( مونافەسە ) دەکەن بۆ نزیك بوونەوە لە پیاو و ڕازی کردنی ......

بەلام ئیستاکە ژن لە پیاوی ناترسی لە سەر پیاوەکەی زال بووە و پیاو ناتوانی لەقسەی ژنی دەرچی و ناویری ژنی تر بینی ئەو مونافەسەو پیش برکی‌یەی ئافرەت چۆتە دەرەوە لەسەر شەقام و بازارەکان و لە سینەماو جی‌ی رابواردنن .... هیچ خەمیان نیە تەنیا خۆ پیشان دان نەبی .... ئەوەش هەم پیاوی لە ئاین وەرگیرا هەم خۆشی بووە جی‌ی نەفرەت و هیچ ریزی نەما .

بۆچی ژن حەز لە فرەژنی ناکات ؟

١- گومان لەوەدا نیە کە فرەژنی شتیکی گرانە ...... چونکە ووتمان هاوتا بۆ ژنەکە پەیدا دەبی لە دلی پیاو لە گیرفانیشی .... ئەوەش هیچ ژنیك ناتوانی چاوی لی بپۆشی بەلام مرۆڤ حەز لە زۆر شت ناکا ، ئەگەر هەستی کرد ناچارە ، واز دینی و رازی دەبی بەوەی کە ئەوشتەی دەستی نەکەوت . واتە ئەگەر چی ژن حەزی لە ژنی تر نیە ببیتە هاوتای بەلام ئەگەر زانی هیچ چاری نیە ئەوا رازی دەبی .

٢- کاتی پیاو ژن دینی لەبەر یەك هۆ ، ئەویش ژنەکەی لەبەر چاو کەوتووە و حەزی لەژنی ترە ، ژنی دینی و ئەوی تر بەرەللا دەکا ئەو پیاوە هەموو جولانەوە و هەلسو کەوتی لەژیر کۆنترۆلی ئەو ژنەدادەبی و ژنی یەکەمیش واز لی دینی . هیچ بیر لە ری‌ی خوا ناکاتەوە کە دەبی بە دادوەری بجولیتەوە لە گەلیان .

٣- هەندەی پیاو ژن دینن ، هەموو ژنەکان لە خانویك دادەنین هەلس و کەوتیشیان جیاوازە لەگەلیان . لەگەل یەکیان خراپە ، لەگەل ئەویتریان نەك هەر باشە بەلکو زۆر باشە . ئەوەش کار دەکاتە سەر ژنەکەو دەوروپشتیشی ، کە دژی فرەژنی رابوەستن.

٤- ئەو پیاوەی ژنی خۆی خۆش دەوی و باشە لەگەلی بیر لە ژن هینان ناکاتەوە و تەنانەت ئەگەر ژنیشی پیش کەش بکەن ، یان ژنیك دلی پیوەی بی و خۆشی پیشکەش بکات . ئەوا ژن ناهینی و بەزەیی بەو ژنە بی پیاوانەش نایەتەوە و قوربانی نادات لە پیناوی کۆمەل و بیریشی لی ناکاتەوە . هەست بە ئەرکی سەرشانی ناکات کە دەتوانی چوار ژن بەخیو بکات و منالی هەتیویش بەخاوەن بکات . ئەگەر ئەو پیاوە لە پیشەوای ئاینیش بیت و بزانی ئیستا زۆر ژنە بۆتە ئەرکی تایبەت (فرض عین ) ....... ئەگەر بیتووزانایان بەچاویکی ئاینی و تەقواو بەزەیی بیر لەو

ڕۆژگارەی ئافرەتان بکەنەوە ڕێگا چارەیان بۆ دانێن ئەویش تەنیا فرەژنەیە ... بەڵکو زۆر لە پێشەواو زانا ئاینیەکان لە ژنەکانیان دەترسێن ئەوەش پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەرە ( د.خ ) کە دەفەرموێ ژن ئەسیرە بەڵکو لە زۆر شوێن وە زۆربەی پیاوان بونەتە ئەسیری دەستی ژن ( پەنا بە خوا ) بەلآم نابێ موسڵمان لەو جۆرە بن چونکە وای لێدێ ژنەکەش چاوی بە بەهەشت نەکەوێ و کار لە باوەڕی پیاوەکەشی دەکات .

٥- چونکە پیاوو ژن پەروەردەی دەستی ژنن ئەویش ( دایك )ە وە ئەو دایکەش هەموو کات دژی زۆر ژنە بووە لەبەر خۆی ، لەبەر ئەوە ئەو کۆمەڵگایەش دژی فرەژنی ڕاوەستاوە . بێ ڕەچاو کردنی ئەو ڕۆژگارەی کە تیای دەژین .

٦- زۆرەها کچی گەنج لەدڵەوە بە هیوای ئەوەن بەهاوسەر بن لەگەڵ پیاوی بەژن بەلآم لەبەر شەرم کردن ناتوانن ئاشکرایی بکەن . چونکە خۆیان دژی فرەژنی بوونەو پشتی دایکیان گرتووە دژی باوکیان . ئێستا چۆن خۆیان پاش گەز ببنەوە .وە زۆربەی دایکەکان ڕازی نین کچیان بدەنە پیاوی بەژن چونکە خۆیان حەزیان نەکردووە و فرەژنی یان ڕەت کردۆتەوە و توانیویانە سەرکەون بەسەر ئارەزووی مێردەکانیان و نەهێڵن ژنیان بەسەر بێ بەهەر ڕێگایەك بووبێت بێ گومان ڕێگاکانیش هەمووی دوورە لە ئاینی ئیسلامی پیرۆزەوە .

٧- زۆر لە ئافرەتان کاتێك مێردەکەی ژن دێنێ خۆی واز لە مێردەکەی دێنێ و ڕێگای نادات لێی نزیك بێتەوە . بەلآم بەهۆی فرمێسکەکانی ڕای گشتی سەرزەوی بۆخۆی ڕادەکێشێ و هیچ بیر لە پاشەڕۆژ ناکاتەوە . کە بێ دڵی مێردەکەی کردووە ،لە ڕێی ئاین دەرچووە چونکە بۆی نیە دژی ئارەزووی مێردەکەی بوەستێ .بەڵکو زۆر ژن بەپیاوەکانیان دەڵێن ئەگەر ژن بێنی خۆم و منالەکان لە دەست دەچێ . ئەگەر بێتوو ئەو ژنە باوەڕی تەواو بێت دەبێ بزانێ ئەو جۆرە کارە لە دەسەلآتی ئەو نیە .

٨- زۆر بیرکردنەوەی تەسکی تر هەیە کە ژن بیری لێ دەکاتەوە بۆ ئەوەی ڕێ لە فرەژنی بگرێ . بەلآم هەمووی دوورە لە ئیسلام ، چونکە ئەو بەرەڵلآییەی کە کۆمەڵگا بەگشتی و وە ئافرەتان بەتایبەتی لێی تێ کەوتوون کە هەموو هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ بە شوونەدانی کچان و مانەوەیان. ئەویش بووە هۆی هەزارەها

ئەخۆشی دەروونی و جەستەیی . چونکە خوای گەورە ئارەزووی (جنسی) داوەتە مرۆڤ و ئەویش پێویستی بەتێرکردن هەیە .دەبینین رۆژ ئاوا بە حەرامی ئەژین و خۆیان تێر دەکەن . ئەبێ لە کۆمەڵگای ئیسلامیش ئەو ڕێگە حەڵاڵە ئاسان بکرێ بۆ تێر کردنی ئارەزووی جنسی سەرەتای بەرەڵلا بوونی رۆژ ئاوا بەوە دەستی پێکرد کە لەدوای شەری جیهانی دووەم ، ئافرەتی بێ پیاو زۆر بوو ، کەنیسەش فرەژنی حەلال نەکرد ... ئەگەر پیاوانی ئێمە هەست بەو ئەرکە نەکەن ...... ئەبێ کۆمەڵگا وەك ئەوانی لێ بێت ( پەنا بەخوای گەورە ) یان دەبێ پیاوەکان بەراستی هەوڵ بدەن و ئەرکی فرەژنی بخەنە ئەستۆی خۆیان ..... خۆ ئەوانیش چاوەری ناکەن کەنیسە فرە ژنییان بۆ حەلال کات خوا نەکات . بە پێویستی دەزانم پێشەواو زانا ئایینیەکان دەست بە فرەژنی بکەن هەتا ئەوانی تر چاویان لێ بکەن . چونکە هەموو کات مرۆڤ حەز دەکات چاو لە پێشەوای خۆی بکاتەوە لە هەموو بوارەکانی ژیان .

٩- تێکەڵ بوونی ئافرەت و پیاو لە هەموو قۆناغەکانی ژیان کاریکی زۆر خراپی کردە سەر هەردوولا . ژن و پیاو هیچ ڕیزێکیان بەرامبەر یەك نەما لە هەموو شوێنێك ، لە قوتابخانە ، زانکۆ ، بازار ، هتد ......... کە تێکەڵ بوون مونافەسە و پێشبرکی یان لەگەڵ یەك کردو تا وای لێ هات پیاو و ژن ئەتوانن یەکتری هەڵبژێرن . چونکە بەردەوام چەوتی لە یەکتر دەبینن و یەکتر تاقی دەکەنەوە و وابیردەکەنەوە بەو جۆرە دەگەنە ئەو خەونەی خۆیان کە دایان ناوە لە مێشکیان بۆ هاوسەری ژیان ، واش نییە لەراستیدا ، چونکە هیچ ئادەمیزادێك تەواو نیە (الکمال لله) . هەر یەکەو بەشێك کەمو کوری هەیە ئەگەر لەگەڵ یەك وا تێکەڵ نەبونایە ئەوەندەکەمی یەکتریان نەدەدیت ...... وەلەبەر ئەو تێکەڵیە دیارە پیاو لاسایی ئافرەت دەکاتەوە بەخۆ جوان کردن و ژنیش لاسایی پیاو دەکاتەوە بە جل و بەرگ و هاتوو چۆ . واتە هەردوو لا نەیان توانی رەگەزی خۆیان بپارێزن، هەر یەکەیان بەرەو رەگەزەکەی تر لاربوونەتەوە ( پەنابەخوا) لەو حالەتەش تووشی نەفرەتی خوای گەورە دەبن . بەهۆی ئەو تێکەڵ بوونە کە پێی دەڵێن یەکسانی ، شەرم لە نێوان ژن و پیاودا نەما . کاتی گەنجێك دەچێتە داوای کچێك کچە زۆر چاك دەیناسی و کەم و کوریەکەی دەبینی و

دەکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵی زۆر جاریش پێی ڕازی نابێ چونکە یەکێکی دەوێ تەواو بێ لە هەموو لایەنێکەوە { چاوی کراوەتەوە دوور لە ئاین و ڕەوشتی بەرز } . بەو جۆرە ئەو ژنە کە خۆی یەکسان داناوە لەگەڵ پیاوەکەی ڕازی نابێ ژنی بەسەر بێت چونکە تەواو تێگەیشتووە کە وەك پیاوەکەیە ، ئەرك و مافیان بەرامبەر بەیەك و ئەوەندەناترسێ لەوەی پیاوەکەی ڕازی بکات یان نەء .

لەبەر ئەو هۆیانە و چەندەها هۆی تر پیاو لە ژنێك زیاتر ناهێنێ . بەڵام لەهەمان کاتدا (یەك ژنە) کارێکی زۆر خراپی کردە سەر کۆمەڵگا بەگشتی ، ئەگەر بەبیرێکی ڕۆشن و هەڵوێستی ئیسلامیانە تەماشای بکەین لەوانە :

١ - پیاو ناتوانێ بەئاسانی ژن بێنێ چونکە لەبیری دایە کە هەتا مردن هەر ئەوەندەیە هەر چۆنێك بێت ، لەبەر ئەوە زۆر بیردەکاتەوە و چاوەڕێ دەکاو دەگەڕێ هەتا بەبۆچوونی خۆی ژنێکی بە دڵ دەبێت . وەنیە گەنجی موسوڵمان بیر بکاتەوە زۆر ژن دێنێ ئەوە بەئاسانی یەکەم جار ژن دێنێ و دوایش ئەگەر یەکێکی بەدڵ بوو بیهێنێ و هەر بۆی ڕێك کەوت هەروا بەئاسانی وەك پێشینە چاکەکانمان ژن بهێنێ . نەخێر ئەوە لایان حەرامە ( أعـوذ بـالله ) . لەبەر ئەوە کچ و کوڕ زۆر درەنگ بەهاوسەردەبن و ئەوەش کار لە کۆمەڵگە دەکات کە ئەو هەموو گەنجە بێ هاوسەرەی تیایە ، هەموو کات نزیکن لە تاوانی گەورە و بچووك بەڵام دەبێ بیر کردنەوەی پیاوی موسوڵمان وەك نەسارەکان نەبێت و بیرکردنەوەیەکی ئیسلامی بێت . کە دەتوانن چوار ژن بهێنن .

٢- پیاو بەزۆر ژنە خێری زۆری پێ دەگات بەوەش کەچەند ژنێك لە تەنیایی ڕزگار دەکات ئەوەش لەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (د.خ) دیارە کە دەفەرموێ : عن ابي ذر الرفاعي(رضى الله عنه ) قال : ( قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) :على كل نفس في كل يوم طلعت فيه الشمس صدقة منه على نفسه" قلت يا رسول الله من أين أتصدق، وليس لنا أموال؟ قال: لأن من أبواب الصدقة: التكبير، وسبحان الله والحمد لله، ولا إله إلا الله، وأستغفر الله وتأمر بالمعروف، وتنهى عن المنكر، وتعزل الشوك عن طريق الناس، والعظم ،

والحجر، وتهدي الأعمى، وتسمع الأصم والأبكم، حتى يفقه، المستدل على حاجة له قد علمت مكانها، وتسعى بشدة ساقيك اللهفان المستغيث وترفع بشدة ذراعيك مع الضعيف، كل ذلك من أبواب الصدقة، منك على نفسك، ولك في جماع زوجتك أجر" (رواه احمد واللفظ له ومعناه ايضا في مسلم) .

وعند مسلم قالوا يا رسول الله يأتي أحدنا شهوته، ويكون له فيها أجر؟ قال أرأيتم لو وضعها في حرام أكان عليه فيها وزر؟ فكذلك اذا وضعها في الحلال كان له أجر"

واته : پرسیاریان له پیغەمبەر کرد (د.خ) ئەو کەسەی لەگەل خیزانی جماع بکات خیرە ؟ فەرمووی ئەگەر بەحەرامی بیکا واتە زینا بکات ئایا تاوانی لەسەرە ؟ کەواتە ئەگەر بە حەلالیش بیکات ئەوە خیر و پاداشتی بۆ ئەنووسری ، ئینجا خیرەکە زۆرە بەقەدەر ئەوەی بەحەرامی کە تاوانەکەی گەورەیە .

٣- شتیکی زۆر گرنگ هەیە ئەویش ئافرەتان حەزیان لە موونافەسەو پیشبرکی هەیە لەسەر شتی دونیای . هەر لەبەر ئەوە لەناو بی باوەران ئافرەت هەر رۆژەی لەگەل پیاویك رادەبویری ( پەنا بەخوا ). تەنیا هەتا خۆی پیشان بدات و شەیتانیش ئیشەکەی لا خۆش و جوان دەکات . بەلام ئەگەر هاتوو ئەو پیشبرکی‌یە لەناو خیزان لەنیوان کۆمەلە ژنیك بوو بەحەلالی ئەوە بە سوودی پیاوو ئینجا کۆمەل دەگەریتەوە ئەگەر پیاو زۆر ژنی هەبوو . ئەو ژنانە لەبەر یەکتر بۆ نزیکی لەدلی پیاویان ئاگایان لە ئافرەتانی دەرەوە زۆر نابی و ئەگەر پیاوەکە پیشەوا ( قدوە )بیت لەگەلیان ئەوا پیشبرکییە لە سنووری شەرع لانادات .

٥- زۆر جار کە پیاو یەك ژنی هەیە و ئەو ژنەش بەسەر میردەکەیدا زالە هەموو هەلیکی پیاوەکەی خۆی قۆزتیتەوە و (استغلال)ی‌کردووە بۆ سوودی خۆی وای لە پیاوەکەی کردووە کە دایك و خووشك و کەس و کاری لەپیش چاوی بکەویت و ئەوجا ئەو پیاوە بی ئەوەی هەستی پی بکات تووشی نەفرەتی خوای گەورە و پیغەمبەری خوا بووە (د.خ) کە فەرموویەتی :

٦- ﴿ ملعون من آثر زوجته على أمه ﴾ . له شوێنێکی پێشتر باسمان کرد که ئەرکی دایك له پێش هەموو کەسێکه بۆ پیاو . بەلأم لەبەر ئەوەی ژنەکەی ناهێڵێ ئەو پیاوه ناوێرێ هیچ پەیوەندیەك لەگەڵ دایکی بکات و زۆر جار ژنەکەی وا له پیاوەکەی دەکات که دایکی لەبەر چاو بکەوێت و بەچاوی ڕق و کینه سەیری خزمی خۆی بکات . هەموو هەوڵی بۆ ژنەکەی و دەوروپشتی ژنەکەی بێت .

پێغەمبەر (د.خ) چەندین فەرموودەی هەیه لەم بارەیەوه که دەبێ ژن بێ دڵی مێردەکەی نەکات . بەلأم ئەگەر بێت و ئەو پیاوه سێ چوار ژنی هەبێت . لەبەر ئەوەی هەموویان هەوڵی ڕازی کردنی دڵی پیاوەکەیان دەدەن ، بۆ ئەم مەبەستەش ئامۆژگاری دڵسۆزانەی دەکەن و پەیوەندی بەتین لەگەڵ خێزان و خزم و کەسی مێردەکەیان دەبەستن . ئەگەر واش نەبێت ئەو پیاوه خۆی دەتوانێ بیر کردنەوەی ڕاست له ژنەکانی ببینێ .

بەهەر حاڵ زەرەری فرەژنەیی زۆر کەمتره له زەرەری یەك ژنه و تاوانی دادگەری نەکردن له نێوان ژنەکانی کەمتره له تاوانی ڕابواردن و بەرەڵلأیی که دنیا و قیامەتی لەدەست دەچێ له دنیادا وا دیاره نەخۆشی ( ئایدز و زەهری ) زۆر بلأوه و باشترین نموونەشه بۆ ئەنجامدانی بەرەڵلأیی . سبحان الله پیاو چەند ژن بهێنێ به حەلأڵی تووشی هیچ لەو دەردانه نابێ . کاتێ بەڕابواردنی حەرام ئەو هەموو نەخۆشیه سامناکه بەرەو ڕووی دەبێ و تووشی ناڕەحەتی و ناخۆشی دێت و تووشی ڕووڕەشی دنیاو دوا ڕۆژیش دێ ( پەنا بەخوای گەرەو میهرەبان )

لەهەمان کاتدا ئافرەت وا سەربەخۆ بووه و ڕووت بووه له جل و بەرگی شەرعی و حەیاو شەرم که هەمووشی حەرامه...... ئیشی حەرام بۆ پیاو ئاسان کراوه . بەلأم کاتێ که خوای گەوره چوار ژنەی حەلأڵ کردووه بۆ پیاو ئەو هەڵەی نەقۆزتیتەوه ...... والله ئەگەر ئەو روخسەته بەژن بدرابا ئەوه هەر هەمووی چوار شووی دەکردوو هیچ خاتری پیاویشی نەدەگرت ئەوەش تەنیا لەبەر ڕووحی مونافەسەو پێش بڕکێ .

ئەوەش دیاره لەو خۆنیشان دانەی ژن دەیکات هەتا چوارپیاویان بۆ ئاسان بکرێت وه ئەو خۆ ڕووت کردنەوەی ژنه بەرامبەر هەر پیاوێك ئەوه نیشان دەدات .

لـه كۆتـايیدا چـەند خـاڵیك هەیـە لـەبیرم دەمـەوی بەشـیوەیەكی كـورت بیخەمـە سەرلاپەرەكە ك

١- خاوەن كچ كاتی خوازبینی كچیان كرد پیویست ناكات گرنگی بدەنە ئەوەی ئایا ئەو پیاوە ژنی تری هەیە یان نا ؟ وە هـەروەها ئـەو ژنـە لەسـەری نیە مـەرج بكات كە ژنی پیشووی تەلاق بدات هەتا ئەو رازی بیت ، چونكە ئەو رەفتارە حەرامەو ری‌ی پی نەدراوە لە ئاینی ئیسلامی پیرۆز . پیغەمبەر (د.خ) دەفەرموی : ﴿ عن أبي هريرة (رضي الله عنه) ان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال: لاتسال المرأة طلاق اختها لتستفرغ صحفتها ولتنكح فان لها ما قدر لها ﴾.

٢- باپەلە بكری و هەولی بۆ بدری كە بی هاوسەران بە هاوسەر بكرین ز بەزەییمان بە كچەكانمان بیتـەوە و ئاسانكاری بكـەین بـۆ دابین كردنـی ئایینـدەیـان . پیـش ئـەوەی كار لەكار بترازی و ئەو كاتەش پەشیمانی داد نادات .

٣- هاندەرین بۆ فرەژنی ، چونكی لـەو سـەردەمەی ئیمـە و بەتایبـەتی لـە كوردسـتانی خۆشەویست كە تووشی گەلی كارەساتی دلتـەزین بـووە و زۆربـەی گەنجـەكان پیـش ئەوەی شاد بن بە هاوسەریان لەناو چوون و بوونە قوربانی ئەو هەموو پیلانە ناپاكەی كە دوژمنانی بۆی دادەریژن بۆیە وای كرد ریژەی ئافرەت زۆر زیاد بكات بەرامبـەر بـە پیـاو ، وە مـافی رەوای خۆیانـە كـە بەهاوسـەر بكریـن و پیویسـتە سیكسیەكانیان تـیر بكەن بە حەلالی و سەربەرزی . پیویستە ئاینی ئیسلام ببیتـە خۆشـی بـۆ هـەموان ، نەوەك تووشی ئاژاوەو تاوانی حەرام بن و هـەردوو دنیایان لەدەست بچیت . چونكـە هیـچ چارەیـەكی دیكـەمان نی‌یـە بـۆ بەهاوسـەر كردنـی ئـەو ریـژە زۆرەی كچـان كـە ماونەتـەوە ، كـوری گـەنج زۆر بـە زەحمـەت بریـاری ژنـهینان دەدات و بەتایبـەتی لـەو كاتەدا كە ئەركی ژنهینان زۆر گران بووە ، بەلام پیاوی بەژن زۆر بەئاسـانی بـەئافرەتی تر رازی دەبی و كاتی دەیەوی بیكاتە فرەژنی ، چونكە ئـەو تـاقی كردنەوەیـەی دیتـوە جاریكی تر ئەوەش هەر لە میهرەبانی خـوای گەورەیـە كەوا هەرچەندە گەنجیش نیە ئەوكچانە بە هاوسەربكات ئەو ریگەیەش هەیە بۆ بەهاوسەربوونی ئافرەت .

٤- دەبێ دان بەوەدا بنێین کەزۆربەی ئافرەت مافی پیاو نادات . ئەو مافەی کە خوای گەورە کردیتیە ئەرك (واجب) لەسەری ، بەتایبەتی پاش ماوەیەك لەبەهاوسەربوون و زیادبوونی ئەرکی ماڵ و منداڵ . ئەگەر پیاوە بێ باوەڕەکان بەهەموو ئالأیەکی بێ شەرعی و تێکەڵاوی و بەرەڵڵاییەی هەڵیان گرتووە وا بەشێوەیەکی حەرام بەئافرەت ڕادەبوێرێ. بێ ئەرکی هاوسەرێتی و بەخێوکردن . وەزۆر ڕەوشتی تری حەرام ئەکەن بۆ خۆشی خۆیان .

بەڵام پیاوی موسڵمان کە دوورە لەو هەموو ڕەوشتانە دەبێ بتوانێ فرەژنی بهێنێ و بەحەڵاڵی بژی و دژایەتی سروشتی بوونی خودی خۆی نەکات . کە خوا تاکە چارەی فرەژنی بۆ داناوە و چاری تری نی‌یە ، بەتایبەتی ئەو پیاوانەی بەهۆی ئیش و سەفەر دوورن لە خێزانیان. پێویستە ژن بێنێ هەتا دەگەنەوەخێزانیان و گەنجەکانیش ژن بێنن و ئەوانەی لەوڵاتانی ( اهل الکتاب ) دەژین هەتا ڕێك دەکەوێ ژنیش لەووڵاتی خۆیان دێنن . نەوەك تووشی تاوانی زینا ببێ (پەنابەخوا ) دواییش نەخۆشی وەك (ایدز) . بەحەڵاڵی دوو ژن بەخێو بکەن و ئەگەر توانیان ئەو ژنە ( اهل الکتاب ) موسڵمان بکەن . ئەوە خێری زیاتریشە و بەو جۆرە موسڵمان لەناویان زۆر دەبێ و ئایینەکە بڵاو دەبێتەوە .

٥-دەبێ بزانین منداڵ (کوڕ و کچ) بەهیچ شێوەیەك مافی ئەوەی نیە لەڕوی شەرعەوە دژی ویستی دایك و باوکی بێت لەژن هێنان و بەهاوسەر بوونی دایکە بێ پیاوەکەی ... بەڵکو پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی :

هەردایك و باوکێك لەدەست منداڵی گریا خوا ڕەحم بەو منداڵە ناکات. واتە نابێ منداڵ ستەم لە باوکی بکات لە مافی ڕەوای خۆی . وە ژنیش نابێ دژایەتی مێردەکەی بکات و نەهێڵێ ژنی بەسەر بێ و خۆی تووشی نەفرەتی خوا بکات ، کە بەقسەو ئارەزووی مێردەکەی نەکردووە . بەمەرجێك ئەو پیاوە بەڵێنی داد وەری بدات لەنێوان ژنەکان . منداڵیش گەرهۆی کەم باوەڕی نەبێت هیچ هۆی تر نیە کەدژی باوکی بوەستێت .

٦- ئەی خوشکانم ئەگەر لەژێر ڕۆشنایی ئاین بیربکەینەوە ، دوور لەبیر کردنەوەی ماددی ( کەدەبێ ئەو پیاوە خۆی و گیرفانی ببێتە موڵکی تۆ ، لەهەموو دنیای

بستینی هەتا لەدایك و باوكیشی ) فرەژنی ئاسان دەبیت ، بەلكو هەموو كات لەبەر ئەو مونافەسەیەی لەنیوان ژنەكانە ژیان نوی دەبیتەوە و هەریەكە لەژنەكان هەولدەدات ئەركی سەرشانی بەرامبەر میردەكەی جیبەجی بكات. بەمەرجیك ئەو ژنانە لەخواترس بن و دووربن لە بیری تەسكی تۆلەسەندن و رق و كینە .

٧- نابی دەوروبەر ری لەفرەژنی بگرن بۆ نموونە خیزان و خزمی ژنەكە نەبنە كۆسپ لەریی زاواكەیان و نەهیلن ژن بەسەر كچەكەیان بینیت . ئەوە لادانە لەشەرعی خوای گەورە (پەنا بەخوا) چونكە ئەو پیاوە ، خاوەن دەسەلاتە لەرووی ئاینەوە .

٨- گەورە بوونی گیروگرفتی فرەژنی تەنیا بەهۆی پیاوە . چونكە یەكەم نەیتوانی بەدادوەری لەگەل ژنەكانی بجولیتەوە و بەشیوەیەكی ناشرین و ستەم فرەژنی پیشاندا . دووەم لەبەر چەند هۆیەكی ناشەرعی دەترسی لە فرەژنی ئەو پروپاگەندە دوور لە باوەرانە كاری كردیتە سەریان . بەلام دەبی موسلمان كەسانیك بن كەخوای گەورە لە قورئانی پیرۆز باسیانی كردووە و دەفەرموی ( لایخافون في الله لومة لائم) واتا لەكەس ناترسین لەریی خوادا ( جل وعلا ) هەرچەندە نەزانەكان پروپاگەندە بكەن . موسلمان گویی پی نادات ..... چونكە ئەو نەزانانە كەر و لال و كویرن لەراست شەرعی خوا .

٩- بەراستی ژیانی پیشینە صالحەكانمان خۆش بووە ، لەوەی ئافرەت بەشكۆمەندی ئازوو ئابرووی خۆی دەمایەوە . پیاوان خۆیان بەخەم بوون لەوەی ئافرەتیك بی پیاوبیت . چونكە ئەگەر پیاوان خەم لە ئافرەت نەخۆن ، هەر پیاوە و خۆشی خۆی بوی لەگەل خیزانەكەی بە تەنیا . ئەو هەموو ئافرەتە بی دەسەلاتە شەرمنە بەتەنها بمیننەوە؟! دەبی ئەو سەر زەویە چۆن پربی لەتاوان و ستەم( خوای گەورە پەنامان دات ) . ئافرەت خۆی بگەری لە پیاو . پیاوی بی ژنیش دەست نەكەوی . لەهەمان كاتدا ئەو ئافرەتانە هەلخەلەتاو و بیرتەسك بوون لەوەی دەبی ئەو هاوسەرەی پیی رازی دەبن گەنج بی و سامانداربی و هەروەها ناوداریش بی .. ئەوەك شەرم دەكەن شوو بە پیاوی هەژار بكەن . یان رازی بن بە پیاوی بەژن چونكە لایان وایە ئەگەر بی پارە شوو بكەن ئەوا سەر بلند نابن لای نەزانەكان زۆر كچ چەندەها

دەرفەتی بەهاوسەر بوونی لەدەست دەچیٚ لەبەر ئەوەی بیر تەسکە و بە هاوسەر بوون و منداڵ و دایکایەتی بەقوربانی نەزانی دەکات . لەبیر خۆی دەباتەوە کەوا ئەو منداڵەی کە بەهۆی بەهاوسەر بوون پەیدا دەبیٚت هەموو ماڵی دنیا دیٚنیٚ . هەرچەندە هەژاریش بیٚت . ئەو ژیانی هاوسەرایەتی‌یە خۆشترو بیٚ تاوان ترە لە ژیانی تەنیایی .

لەکۆمەڵگاکەماندا زۆر پرسیارو بیرو بۆچوون و بیرکردنەوەی تەسك ونادروست هەن ، وانیشان دەدەن کە فرەژنی باوی نەماوە و سەردەمی بەسەرچووە لەوانە :

١- دەڵیٚن لەوکاتەی قورئان داددەبەزی فرەژنی حەلاڵ بوو چونکە شەڕ و شۆڕ هەبوو وە زۆرینەی پیاوان ژیانیان لەدەست دەدا بەهۆی ئەم شەڕ و شۆڕە .

وەلاٚم :- لەو سەردەمەدا یەکەم جەنگ کەکرا لە ساڵی (٢)ی کۆچی بوو ئەویش جەنگی (بەدری گەورە) بوو تەنها (١٤) موسڵمان تیایدا شەهید بوون . دوای ساڵیٚك جەنگی (احد) ڕووی دا کە زۆر موسڵمانی تیٚدا شەهید بوو ئەویش (٧٠ ) کەس بوون.

ئیٚستا لە ساڵیٚك دا هەزارەها کەس بە ڕووداوی ئۆتۆمبیل گیان لەدەست دەدەن وە هەروەها بەهۆی ( شەڕی نیٚوان ئیٚران و عیٚراق )وە نزیکەی یەك ملیون پیاو لەناو چوو وە تەنیا لە بەکارهیٚنانی چەوتی چەك ساڵیٚ سەدەها کەس دەکوژریٚ . بەڵگەشمان بۆ ئەوە ئەو هەموو بیٚوەژن و کچەیە کە بەتەنها ماونەتەوە .

بۆیە گرنگترین حکمەتی فرە ژنی ئەوەیە : نابیٚ ئافرەتی بیٚ هاوسەر هەبیٚ . دەبیٚ پیاو ئەو قوربانی‌یە بدات بەوەی ڕازی بیٚ بە فرەژنی و ئەو ئافرەتانە لەتەنیایی ڕزگار بکات و ئەو ئەرکە گەورەیە هەڵگریٚ کەبریتی‌یە لە بەخیٚو کردنی ماڵ و منداڵ .

٢- ئەڵیٚن پیٚداویستی ژیان جاران ئاسان بوو ئیٚستا زەحمەتە :

لەوەلاٚمدا دەڵیٚین ئەو کاتەی کە پیٚشینە چاکەکانمان ژنی تریان دەهیٚنا نان نەبوو بیخۆن بەڵکو زۆر جار ئاگر لە ماڵیان نەدەکرایەوە بۆ ماوەی چەند ڕۆژ . زۆربەی خەڵك لە ڕۆژیٚك دا دوو جەم نانیان دەخوارد . بەلاٚم ئیٚمە چاومان برسی بووە . هەموو شتیٚکی دنیامان دەویٚت . بۆ خۆشی خۆمان ، نامانەویٚ خەم لە دەورو پشت بخۆین .

٤- زۆر کەس دەلی خۆزگە فرەژنی حەلال نەبوایە (اعوذبالله) . ئەوە تەنیا بیرکردنەوەی خۆپەرستیە چونکە ئەو هەموو ژن و کچە ماونەتەوە چاریان چیە ؟! پیشینە چاکەکانمان کە دەیان دیت ئافرەتیك بی هاوسەرە زۆر بە زوویی باوکی خەمی لی دەخوارد و پیشکەشی پیاویکی دەکرد هەرچەندە ژنیشی هەبوایە نەی دەوت گونجاو دەگاتی وە پیاوانیش داوایان دەکرد کە ئافرەت بی هاوسەر نەمینیتەوە ، تەنیا ئەو ئافرەتە دەمایەوە کە بی ترس و بی شەرم رازی بوایە بە تەنیا بمینیتەوە منداڵی خۆی بەخیو بکات . چونکە زۆر کەس حەزی لی یە بەهاوسەربی لەو رۆژگارە بەلام لەزۆر لایەنەوە شەرم دەکات . ئەوەش تاوانە بۆ خۆی و دەوروبەری چونکە چ ژن و چ پیاو نابی خۆیان نزیك بکەنەوە لە هۆیەکانی زینا . پیغەمبەر (د.خ) دەفەرموی زینای چاوتەماشاکردن و زینای دەست بەیەککەوتنیەتی و هی تریش ..... )

بی گومان ئەرکەکانی ئیسلام گرانن لەسەر دلی مرۆڤ و هەمووی سەبروو خۆراگرتنی دەوی . خوای گەورە لە قورئان فەرمانمان پی دەکات سەبر بگرین لەگەل ئەوەی خواپەرستی دەکەین . گیروگرفتی فرەژنی بە نەهیشتنی فرەژنی تەواو نابیت ، بەلکو پیویستە پەرە بستینری بە فرەژنی لەناو کۆمەل تا ببیتە ئیشیکی سادە و سروشتی . ئەو هەموو ئافرەتە بی پیاوە تاوانیان چی یە ؟ بەهیوای ئەوەی بمرن ؟ یان تووشی تاوانی گەورە بن و ئاگری دۆزەخ چاوەرییان بکات ؟ .. بەلام تاوانەکەیان بۆ پیشەوایان و زانایانی ئاینیە ئەگەر ئەوان دەست بە هینانی ژنی تر بکەن و هانی پیاوانی تر بدەن و ئەگەر کچیان هەبوو پیشکەشی پیاوی بەژنی بکەن ئیشەکە لای خەلك ئاسان دەبی بەراستی لەو سەردەمەدا ژن زۆر زیادی کردوە ، ریگرتنیش لە فرەژنی دەبیتە یەکەم هۆی تیك چوونی کۆمەل لەرووی ئاینی و کۆمەلایەتی یەوە .

دەبی پیاوی موسلمان هەردەم خەمی کۆمەلگای بیت خەمیکی راستەقینە . نەك تەنها لە ئامۆژگاری خەلك دەست پی بکات ، بەلکو خۆشی هەول بدات بۆ نەهیشتنی ئەو گیرو گرفتەی کە رۆژ بە رۆژ زیاتر دەبی .

قال رسول الله ( صلى الله عليه و سلم ) : ﴿ مَثَلُ المُؤمِنينَ فِي تَوادِّهِم وتَراحُمِهِم وتَعاطُفِهِم كَمَثَلِ الجَسَدِ إذا اشتَكَى مِنهُ عُضوٌ تَداعَى لَهُ سائِرُ الجَسَدِ بالسَهَرِ والحُمَّى ﴾ رواه البخاري .

**چەند نموونەیەك لەپێشینە چاكەكانمان لەسەر فرەژنی:**

١- ژنێك هاتە لای (عبدالرحمن بن عوف) ڕەزای خوای لێبێ كەیەكێكە لە دە مژدە پێ دراوەكان و ووتی : یا عبدالرحمن من تۆم كردە وەكیلی خۆم تۆ بەشووم بدە گەرهاتنە خوازبێنیم . ( عبدالرحمن ) ڕەزای خوای لێبێ فەرموی : تۆ ڕازی دەبی بە هەریەكێكت بدەم ؟ ژنەكە ووتی بەڵێ . عبدالرحمن لە وەڵامدا ووتی ئەوە تۆم دایە خۆم . لەم نموونەیەدا بۆمان دەردەكەوێ كە موسڵمانانی پێش ئێمە كە چەند بە ئاسانی ژنیان دێنا و شویان دەكرد .

٢-كاتێ عمری كوڕی خطاب ڕەزای خوای لێبێ كچی ئیمامی عەلی و فاطمة الزهراء (ڕەزای خوایان لێبێ)ی هێنا ناوی ام كلثوم بوو سێ منالی بوو لە عمری كوڕی خطاب كە ناویان ( زید الاكبر ، رقیە ، فاطمة ) بوو كە عمر شەهید كرا ( عون كوڕی جعفری كوڕی ابو طالب ) كە دەكاتە كوڕی مامی ام كلثوم چوو بۆ داخوازی و پاشان (ام كلثوم)ی هێنا بێ ئەوەی بڵێن چۆن دەبێ خێزانی امیر المؤمنین شووبكاتەوە لەپاشان ام كلثوم شووی بە (( عبدالله ))ی كوڕی جعفر كرد ، كە ئیمامی عەلی شەهید كرا (( عبدالله كوڕی جعفر )) ژنی ئیمامی علی مارە كردەوە واتە ژنی ئیمامی علی مارەكردەوە واتە كچەكەی ئیمامی علی و زڕدایكەكەی بوونە خێزانی عبدالله .

٣- علی كوڕیابی طالب ڕەزای خوای لێبێ زۆر ژنی هێناوە لەپاش مردنی فاطمە (ڕەزای خوای لێبێ) لەوانە : ٢- دایكی ( عیسی ) كە ناوی خەولەی كچی جعفری كوڕی (( قیس الحنفیە)) . ٣- (لیلی ) كچی مسعود التهتلی كە عبدالله ی كوڕی جعفر خوازتی لەپاش مامی . ٤-ام البنین كچی اكرام الوحیدیە . ٥- اسماء كچی عمیسیكە یەكەم جار خێزانی جعفری كوڕی ابی طالب بوو لە پاشان شووی بە ابو بكر الصدیق

کرد له دوایی شووی به علی کوری ابی طالب کرد . ٦- الصهبا کچی بیعه التغلبیه . ٧- دایکی سعید کچی عروه بن مسعود التغلبیه . ٨- امامه کچی ابی العاص بن الربیع العبشمیه که کچی زینب کچی پیغەمبەر ( د.خ) بوو کە پیغەمبەر (د.خ) لە نویژی نیوەرۆ هەلی گرتووە کە فاطمە دەکاتە میمکی ( پلکی ).

بەکورتی وادیارە کە بەهاوسەربوون و فرەژنی ئەوەندە ئاسان بووە بەقەدەر گرانی بەرەللایی بە پیچەوانەی ئەو سەردەمە کە بەهاوسەربوون زۆر زەحمەتە و بەرەللا زۆر ئاسانە لەناو خەلك .

چۆن ئیستا لەکاتی رابواردن لە هەژاری ناپرسن هەر واش لە سەردەمی پیشینەچاکەکان لەبەهاوسەربونی حەلال لە هیچیان نەدەپرسی تەنیا لە باوەرو خوورەوشتی بەرز نەبیت .

وە دواداوامان

الحمد الله رب العالمین و الصلاة علی خیر خلقه محمد (صلی الله علیه وسلم )

دایکی

عبـــدالله

# نـــــاوەڕۆك

| بـــابەت | لاپـــەڕە |
|---|---|
| سـوپاس | |
| پێشکەش | ٣ |
| پێشـەکی | ٥ |
| بەشی یەکەم (بەهاوسەر بوون ) | ٦ |
| ڕێگای ئیسلام بۆ دروست بوونی خێزان | ١١ |
| بیرکردنەوەی کچ و خێزاننەکەی کاتی بەشوودانی لە ئیسلامدا | ١٤ |
| بەشی دووەم ( فرە ژنی ) | ٣٣ |
| مـەرجەکـانی فرەژنـی | ٣٦ |
| چەند نموونەیەك لە پێشینە چاکەکانمان لەسـەر فـرە ژنی | ٥١ |
| نـاوەڕۆك | ٥٣ |

